پوختەی:

# كتاب فضائل القرآن

تأليف الشيخ الإمام العلامة

أبي عُبيد القاسم بن سلّام الهروي

(١٥٧-٢٢٤ هـ)

• عبدالملك الأثرى •

# الإمام أبو عبيد القاسم بن سلام (١٥٧ - ٢٢٤ هـ)

بە ئەسڵ ڕۆمیە، باوکی بەندەیەکی ئازادکراوی ڕۆمی بووە و أبو عبید ی بردووە بۆلای زانایان تا فێری زانستی بکەن .

سەرەڕای ئەوەی خۆی بە ئەسڵ ڕۆمی (ئەوروپی) یە، بەڵام چەندین کتێبی هەیە دەربارەی بوارەکانی زمانەوانی و دەستێکی زۆر باڵای هەبووە تیایاندا .

ناوبانگی دەرکردووە بە شارەزایی لە بواری غریب الحدیث .

تەلەبەی سفیان بن عیینة و شریک بن عبدالله و عبدالله بن المبارک و عبدالله بن إدریس و یحیی بن سعید القطان و زۆر زانای دیکە بووە .

- محمد بن سعد خاوەنی (الطبقات) ئەڵێت : (مُؤَدِب بوو، عەرەبی و نەحو ی بە باشی ئەزانی، تەڵەبی فیقهـ و فەرموودەی کردووە، وە قاضي بووە) .

مُؤَدِب واتە مامۆستا و تەربیەتدەر، پێشتر خەلیفەکان کە منداڵی کوڕیان بووە مامۆستایەکیان بۆ گرتووە بۆ ئەوەی بە باشی فێری قورئان و فەرموودە و شیعر و نەسەب و زمانی عەرەبی و ڕەوشت و دین و ئەخلاق و زانیاری گشتیان بکات .

- یحیی بن معین و علي بن المدیني دێن بۆ لای أبو عبید بۆ ئەوەی کتێبی غریب الحدیث ی لەلا بخوێنن، وە أبو عبید بە دەموچاو یحیی و علي ناناسێت و نازانێت کێن.

علي بن المديني پێی ئەڵێت : (ئێمە لە تۆ شارەزاترین دەربارەی سەنەدی فەرموودەکان، تۆ تەنها پێمان بڵێ واتای ئەو وشە نامۆیانە چییە کە لە فەرموودەکاندا هاتووە*) .

أبو عبيد ئەڵێت : (نەخێر ، من کتێبەکەتان بەو شێوەیە بۆ ئەخوێنمەوە کە نووسراوە، وە ئێوە کێن ؟ ) .

علي وتی : (من علي بن المديني م و ئەویش يحيى بن معين ە ) .

*علي مەبەستی ئەوەیە سەنەدی فەرموودەکانمان بۆ مەخوێنەرەوە ، تەنها واتای وشە نامۆکانی فەرموودەکانمان پێ بڵێ و تەواو، أبو عبيد یش ئەڵێت نەخێر من کتێبەکەتان هەمووی بۆ ئەخوێنمەوە .

- إبراهيم بن أبي طالب النيسابوري ئەڵێت پرسيارم کرد لە أبا قدامة دەربارەی الشافعي و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و أبو عبيد القاسم بن سلام ؟

وتی : (تێگەیشتووترینیان الشافعي یە ، بەڵام فەرموودەی کەم لەلایە - واتە لەچاو سێ دانەکەی تر - ، أحمد بەوەرعترینیانە ، وە حافظ ترینیان إسحاق ە، وە شارەزاترینیان بە لەهجەکانی عەرەب أبو عبيد ە ) .

تەماشا بکە إسحاق بن راهويه کە خاوەنی مەزهەبی خۆیەتی و بەراورد ئەکرێت بە ئیمام أحمد چی ئەڵێت دەربارەی أبو عبيد :

- إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (الله حەقی پێ خۆشە، أبو عبيد لە من تێگەیشتووتر و حافظ ترە ) .

- إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (أبو عبيد لە هەموومان زانیاری زیاترە ) .

- پرسیار لە یحیی بن معین ئەکرێت دەربارەی أبو عبید، زەردەخەنەیەک ئەکات و ئەڵێت : (من دەربارەی أبو عبید پرسیارم لێ ئەکرێت! بەڵکو دەربارەی خەڵکی پرسیار لە أبو عبید ئەکرێت) .

- الدارقطني دەربارەی ئەڵێت : (إمامٌ ثِقةٌ جَبَل) .

أبو عبید ئیمامە لە قیرائاتەکانی قورئانیشدا .

الله تعالی وامان لێ بکات کار و کردەوەکانمان تەنها لەپێناو خۆی بێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت .

وە الله عز وجل بە زانستەی ئیمام أبي عبید سوودمان پێ ببەخشێت و ئێمە و ئەویش لەگەڵ ئەهلی حەدیث حەشر بکات و کۆمان بکاتەوە لە بەهەشتەکەی خۆی، اللهم آمین .

١ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (باشترینتان ئەوەیە كە قورئان فێر ئەبێت ، وە فێری - خەڵكیشی - ئەكات ) .

٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (ئەو كەسەی كە قورئان ئەخوێنێت و تێیدا لێزانە ئەوە لەگەڵ فریشتە بەڕێزە چاكەكارەكاندایە ، وە ئەو كەسەی قورئان ئەخوێنێت و لەسەری قورسە ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە ) .

٣ - إبن مسعود رضي الله عنه ئەڵێت : (هەموو خاوەن سفرە و خوانێك پێی خۆشە - خەڵكی - بێنە سەر سفرە و خوانی ، سفرە و خوانی الله تعالى ش قورئانە ) .

٤ - الأعمش ئەڵێت : (دەشتەكیەك بە تەنیشت عبدالله بن مسعود دا تێپەڕی كاتێك قورئانی بۆ كۆمەڵەیەك ئەخوێندەوە ، یان قورئان فێری كۆمەڵەیەك ئەكرد ، دەشتەكیەكە وتی : ئەوانە چی ئەكەن ؟

فەرمووی : میراتی محمد ﷺ دابەش ئەكەن ) .

٥ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەڵێت : (با بەندە لەبارەی هیچ شتێكەوە لە خۆی نەپرسێتەوە ئیللا قورئان نەبێت ، ئەگەر قورئانی خۆشئەویست ئەوە الله و پێغەمبەرەكەی خۆشئەوێت ) .

٦ - أبو عبيدة ئەڵێت : (عبدالله بن مسعود قورئانی فێری - خەڵكی ئەكرد - ، جا بەسەر ئایەتێكدا تێئەپەڕین ، ئەیوت بە كەسەكە : ئەمە بگرە ، سوێند بە الله ئەوە باشترە لە هەموو ئەوەی لەسەر زەویە ) .

٧ - عبدالله بن عمرو بن عاص رضي الله عنه ئەڵێت : (پەیوەست بن بە قورئانەوە، فێری بن و فێری منداڵەکانتانی بکەن، چونکە لەبارەیەوە لێتان ئەپرسرێتەوە، وە بەوە پاداشتان ئەدرێتەوە، وە بەسە بۆ ئامۆژگاری کردنی ئەو کەسەی کە خاوەن ژیریە ) .

٨ - قتادة ئەڵێت : (هیچ کەسێک دانانیشێت - بۆ خوێندنەوەی - قورئان ئیللا بەجێی ئەهێڵێت بە زیادکردن یان کەمکردنێک ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا﴾ (الإسرَاء : ٨٢) .

٩ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەڵێت : (پەیوەست بن بە دوو شیفایەکەوە : قورئان و هەنگوین ) .

١٠ - إبراهيم النخعي ئەڵێت : (ئافرەتێک بەلای عیسى بن مريم دا عليه السلام تێپەڕی و وتی : خۆشبەختی بۆ کۆشێک کە هەڵی گرتوویت، وە بۆ ئەو سنگەی کە شیری پێ داویت .

عیسى ﷺ فەرمووی : خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی قورئان ئەخوێنێتەوە پاشان شوێن ئەوە ئەکەوێت کە تێیدایەتی ) .

١١ - محمد بن كعب القرظي دەربارەی ئایەتی : ﴿إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ﴾ (آلِ عِمۡرَان : ١٩٣) .

ئەڵێت : (ئەوە قورئانە، هەموویان پێغەمبەریان ﷺ نەبینی ) .

١٢ - هلال بن يساف دەربارەی وتەی الله تعالى : | قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ | ئەڵێت : (واتە ئیسلام) .

وە | وَبِرَحۡمَتِهِۦ | (واتە قورئان) .

١٣ - إبن جريج دەربارەی ئایەتی : | يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ | (البَقَرَة : ١٠٥) .

ئەڵێت : (قورئان و ئیسلام) .

وە دەربارەی | فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ | (البَقَرَة : ٢٠٩) .

ئەڵێت : (ئیسلام و قورئان) .

١٤ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەڵێت : (فێری قورئان ببن و بیخوێننەوە، چونكە بە هەموو پیتێک دە چاكە پاداشتان ئەدرێتەوە، ناڵێم : ألم، بەڵكو : ألف و لام و میم) .

---

: واتە بە خوێندنەوەی هەر یەکێک لەو پیتانە دە چاکە پاداشتت ئەدرێتەوە .

١٥ - أبي وائل ئەڵێت : (وترا بە عبدالله بن مسعود : تۆ ڕۆژووی سوننەت كەم ئەگریت .

وتی : چونکە بێهێزم ئەکات کە خوێندنەوەی قورئان، وە خوێندنەوەی قورئانم بەلاوە خۆشەویسترە لە ڕۆژووی سوننەت ) .

**١٦ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما ئەڵێت : (هەرکەسێک گوێبیستی ئایەتێکی قورئان بێت کاتێک ئەخوێنرێتەوە ئەوە لە قیامەتدا ئەبێت بە نوور بۆی ) .

**١٧ - أبي حصين** ئەڵێت : (پیاوێک هات بۆ لای عبدالله بن مسعود و وتی : فێری چەند وتەیەکی بەسوود و پوخت م بکە .

وتی : الله بپەرستە و هاوەڵی بۆ دامەنێ، قورئان بۆ کوێ ڕۆیشت تۆ بڕۆ بۆ ئەوێ - واتە گوێڕایەڵی بە -، وە هەرکەسێک قسەیەکی ڕاستی کرد، جا دوور بێت یان نزیک، ئەگەرچی کەسێکی دووری بوغزێنراو بێت ئەوە لێی وەربگرە، وە هەرکەسێک درۆیەک بکات، ڕەتی بکەرەوە ئەگەرچی کەسێکی نزیکی خۆشەویست بێت ) .

**١٨ - عون** یان **معن** ئەڵێت : (پیاوێک هات بۆ لای عبدالله بن مسعود وتی : ئامۆژگاریم بکە .

وتی : کاتێک گوێبیستی وتەی الله تعالى | **يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟** | بوويت جوان گوێی بۆ ڕابگرە، چونکە یان فەرمان ئەکات بە چاکەیەک، یاخود ڕێگری و نەهی ئەکات لە خراپەیەک ) .

**١٩ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەڵێت : (ئەم ڕێگایە ئامادەبووی لەسەرە، شەیتانەکانی لەسەرە، ئەڵێن : ' وەرە ئەی بەندەی الله وەرە ئەی بەندەی الله ' تا لە ڕێگای ڕاست لای ئەدەن، جا دەست بگرن بە کتێبی الله ەوە، چونکە حەبلی الله یە).

أبو عبيد رحمه الله ئەڵێت : (مەبەستی عبدالله لە (چونکە حەبلی الله یە) ئەوەیە | **وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا** | ).

**٢٠ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەڵێت : (بەردەوام قورئان بخوێنن تا منداڵەکانتان لەسەری گەورە ببن، وە با گەورەکانتان تەمبەڵی تێدا نەکەن، چونکە شەیتان لە ماڵێک هەڵدێت کە سورەتی بەقەرەی تێدا بخوێنرێت).

**٢١ - فروة بن نوفل** الأشجعي ئەڵێت : (خباب بن الأرت دراوسێم بوو، ڕۆژێکیان پێی وتم : ئەی فلانە کەس، هێندەی ئەتوانیت لە الله تعالى نزیک ببەرەوە، وە بزانە تۆ نزیک نابیتەوە لە الله بە شتێک خۆشەویستتر بێت لەلای لە کەلامەکەی **- واتە قورئان -** ).

**٢٢ - كعب الأحبار** ئەڵێت : (پەیوەست بن بە قورئان ەوە، چونکە تێگەیشتنی عەقڵە، وە ڕووناکی حیکمەتە، وە تازەترین کتێبە لەلایەن الرحمن ەوە).

**٢٣ - أبو موسى الأشعري** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەم قورئان یان بۆتان ئەبێت بە یادخەرەوە، یاخود بۆتان ئەبێت بە پاداشت، یان بۆتان ئەبێت

بە باری سەرشان، جا شوێنی قورئان بکەون، نەوەک قورئان شوێنتان بکەوێت، چونکە هەرکەسێک شوێن قورئان بکەوێت ئەوە ئەیباتە ناو باخی بەهەشتەوە، وە هەرکەسێک قورئان شوێنی بکەوێت لەسەر دەموچاوی ڕائەکێشرێت تا ئەخرێتە ناو ئاگری جەهەننەم) .

---

**: (نەوەک قورئان شوێنتان بکەوێت) واتە قورئان بەو شێوەیە تەئویل و تەحریف مەکەن کە هەوا و ئارەزووی ئەکەن، بەڵکو قورئان وەکو خۆی وەربگرن نەوەک بەپێی هەوا و ئارەزووتان .**

٢٤ - **أبو هريرة** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (باشترین شەفاعەتکار قورئانە، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەڵێت : ' ئەی پەروەردگار بیرازێنەرەوە '، جا تاجی ڕێزلێنانی ئەکرێتە سەر .

پاشان ئەڵێت : ' ئەی پەروەردگار بۆی زیاد بکە '، جا زێڕ و ئاڵتوونی ڕێزلێنانی بەبەردا ئەکرێت .

پاشان ئەڵێت : ' ئەی پەروەردگار لێی ڕازی ببە، چونکە لەپاش ڕازیبوونی تۆ هیچ شتێک نییە '، جا لێی ڕازی ئەبێت) .

٢٥ - **أم الدرداء** ئەڵێت : (پرسیارم لە عائشة رضي الله عنها کرد دەربارەی کەسێک کە هەموو قورئانی لەبەرە، ئایا فەزڵ و پێگەی چییە بەسەر کەسێکدا کە هەمووی لەبەر نییە ؟

وتی : ژمارەی پلیکانەکانی بەهەشت هێندەی ئایەتەکانی قورئانە، جا هەرکەسێک بڕواتە بەهەشتەوە لەوەی کە قورئان هەمووی ئەخوێنێتەوە ئەوە هیچ کەس لەسەرویەوە نییە ) .

٤٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (بە خوێنەری قورئان ئەوترێت : بەجوانی بخوێنە و سەرکەوە وەک چۆن لە دنیادا بە جوانی ئەتخوێند، چونکە شوێنی مانەوەت لە کۆتا ئایەتدایە کە ئەیخوێنیت) .

٤٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (الله سبحانە وتعالی بەخشەرە و بەخشینی خۆش ئەوێت، وە ڕەوشتی جوان و بەرزی پێ خۆشە، وە ڕقی لە خراپەکەیەتی، جا ڕێزگرتن لە سێ کەس لە بەرزڕاگرتنی الله تعالی ـەوەیە : پێشەوایەکی دادپەروەر، وە پیرێکی موسوڵمان، وە کەسێک کە قورئانی هەڵگرتووە کە زیادەڕەو و شلڕەو نییە تێیدا) .

٤٨ - هشام بن عامر الأنصاري ئەڵێت : ( - هاوەڵان - لە ڕۆژی ئوحود ـدا شەکوایان برد بۆ رسول الله ﷺ دەربارەی برینداره‌کان، وە وتیان : فەرمان بە چی ئەکەیت دەربارەی کوژراوەکانمان ؟

فەرمووی : (گۆڕی فراوان هەڵبکەنن بە باشی، وە تێیدا دوو و سێ بنێژن، وە ئەوەیان پێشبخەن کە زۆرتر قورئان ئەزانێت)، جا باوکم لە نێوان سێ کەسدا پێشخرا .

٤٩ - عمرو بن سلمة الجرمي ئەڵێت : کاتێک وەفدی هۆزەکەم چوون بۆ لای رسول الله وتیان : ئەی رسول الله کێ پێشنوێژیمان بۆ بکات ؟

فەرمووی : (ئەوەی لە هەموویان زیاتر قورئانی کۆکردووەتەوە - یان وەریگرتووە).

٣٠ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەگەر زانستت ئەوێت ئەوە تێڕابمێنە لە قورئان، چونکە هەواڵ و باسی پێشین و پاشینی تێدایە).

٣١ - **مسروق** ئەڵێت : (پرسیارمان نەکردووە لە هاوەڵانی محمد ﷺ دەربارەی هیچ شتێک ئیللا زانستەکەی لە قورئاندا هەبووە، بەڵام زانستی ئێمە کەم بووە پێی) .

---

**: مسروق رحمه الله تابیعیەکی فەقیهـ و زانایە، ئەم قسەیەش نیشانەی ئەوەیە کە تێگەیشتنی هاوەڵان رضي الله عنهم بۆ دین زیاترە لە تێگەیشتنی پاش خۆیان، هەربۆیە ئەبێت شوێن هاوەڵان رضي الله عنهم بکەوین لە تێگەیشتنمان بۆ دین .**

٣٢ - **الحسن البصري** ئەڵێت : (الله عز وجل هیچ ئایەتێکی دانەبەزاندووە ئیللا پێی خۆشە بزانرێت کە دەربارەی چ شتێک دابەزیوە، وە مەبەستی پێی چییە) .

٣٣ - **عمرو بن مرة** ئەڵێت : (جاری وایە هەیە ئەو نمونەیانە ئەخوێنمەوە لە کتێبی الله عز وجل و تێیان ناگەم خەفەت ئەخۆم لەبەر وتەی الله عز وجل : | **وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ** | (العَنكَبُوت : ٤٣) .

٣٤ - الربيع بن خثيم ئەڵێت: (بينيم قورئان باسی پێنج شته: حەڵاڵ، وە حەرام، وە هەواڵی ئەوانەی پێش ئێوە، وە هەواڵی ئەوەی ڕووئەدات لە پاش ئێوە، وە هێنانەوەی نموونە).

٣٥ - مجاهد بن جبر دەربارەی وتەی الله تعالى: ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ ۗ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ﴾ (آل عمران: ٧).

ئەڵێت: (ڕۆچووەکان لە زانستدا لێکدانەوەکەی ئەزانن و ئەڵێن ئیمانمان پێی هێنا).

٣٦ - عبدالله بن بريدة ئەڵێت: (پیاوێک قسەی ناشرینی وت بە إبن عباس رحمه الله، ئەویش فەرمووی: تۆ قسەی ناشرین بە من ئەڵێیت لەکاتێکدا من سێ تایبەتمەندیم تێدایە: ئەبیستم کە دادوەرێک لە دادوەرانی موسوڵمانان دادپەروەرە و دڵخۆش ئەبم، لەکاتێکدا هەرگیز دادوەری نابەم بۆ لای، وە ئەبیستم باران لە شوێنێک لە شوێنی موسوڵمانان ئەبارێت و دڵخۆش ئەبم، لەکاتێکدا هیچ ئاژەڵێکی ماڵیم نییە - واتە بۆ ئەوەی زەویەکە سەوز ببێت و بلەوەڕێن تیایادا - ، وە ئەگەم بە ئایەتێک لە کتێبی الله، جا هیواخوازم هەموو خەڵکی ئەوەندەی من ئەیزانم ئەوانیش بیانزانیایە).

٣٧ - إبراهيم التيمي ئەڵێت: (عمر بن الخطاب ڕۆژێکیان بە تەنها بوو و قسەی لەگەڵ خۆی ئەکرد و ئەیوت: چۆن ئەم ئوممەتە جیاوازیان تێئەکەوێت لەکاتێکدا یەک پێغەمبەریان هەیە!

جا ناردی بەدوای إبن عباس دا و وتی : چۆن ئەم ئوممەتە جیاوازیان تێئەکەوێت لەکاتێکدا یەک پێغەمبەریان هەیە، وە یەک قیبلەیان هەیە ؟

إبن عباس وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئێمە قورئانمان بەسەردا دابەزی و خوێندمانەوە، وە ئەزانین دەربارەی چ شتێک دابەزیوە، وە لە پاش ئێمە کۆمەڵانێک دێن قورئان ئەخوێننەوە و نازانن دەربارەی چی دابەزیوە، هەربۆیە بە ڕا و بۆچوون قسەی تێدا ئەکەن، جا کە بە ڕا و بۆچوون قسەیان تێدا کرد ڕاجیاوازیان تێدا دروست ئەبێت، کە ڕاجیاواز ئەبن لەنێو خۆیاندا شەڕ ئەکەن ) .

**٣٨ - عبدالرحمن بن أبي ليلى** ئەڵێت : (لە عبدالله بن مسعود ـەوە ئەگێڕیتەوە کاتێک براکانی لای ئامادە بوونایە قورئانی ئەکردەوە و بۆیانی تەفسیر ئەکرد ) .

**٣٩ - خيثمة** ئەڵێت : (چوومە ماڵی عبدالله بن عمر و قورئانی ئەخوێندەوە، فەرمووی : ئەمە ئەو بەشەیە ئەمشەو ئەیخوێنمەوە ) .

**٤٠ - الحكم بن عتيبة** ئەڵێت : (مجاهد و عبدة بن أبي لبابة و خەڵکانێکی تر قورئانیان بەسەردا ئەخوێنرایەوە، لەو ڕۆژەی کە ویستیان قورئانی تێدا خەتم بکەن ناردیان بەدوای من و سلمة ـدا، وتیان : ئێمە قورئانمان بەسەردا خوێندراوەتەوە، جا کاتێک بمانەوێت خەتمی بکەین پێمان خۆشە ئامادە بن، چونکە ئەوترێت : ئەگەر قورئان خەتم کرا ڕەحمەت دێتە خوارەوە لە کاتی خەتم کردنیدا ) .

٤١ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (هەر کەسێک ئامادەی خەتمی قورئان بێت وەکو ئەو کەسەیە کە ئامادەی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ بێت، وە هەر کەسێک ئامادەی دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان بێت وەکو ئەو کەسەکە کە ئامادەی فەتحێک بووە لەپێناو الله) .

٤٢ - إبراهيم التيمي ئەڵێت : عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرموویت : (هەرکەسێک خەتمی قورئان بکات ئەوە دوعایەکی وەڵامدراوەی هەیە)، جا عبدالله کاتێک قورئانی خەتم بکردایە خێزانەکەی کۆئەکردەوە و دوعای ئەکرد، وە ئەوانیش ئامین یان ئەکرد لەسەر دوعاکەی .

٤٣ - قتادة ئەڵێت : (أنس بن مالک خێزانەکەی کۆ ئەکردەوە لە کاتی خەتمکردنی قورئاندا) .

٤٤ - محمد بن جحادة ئەڵێت : (پێیان خۆش بوو ئەگەر بە شەو خەتم بکەن ئەوە لە دوو ڕکعاتی پاش مەغریب خەتمەکە بکەن، وە ئەگەر لە ڕۆژدا خەتم بکەن ئەوە لە دوو ڕکعاتی پێش نوێژی بەیانی خەتمەکە بکەن) .

٤٥ - أبو الدرداء رضي الله عنه ئەفەرموویت : (پرسیارم کرد لە عائشة دەربارەی هەڵسوکەت و ڕەفتای رسول الله ﷺ .

فەرمووی : هەڵسوکەوت و ڕەفتای قورئان بوو، ڕازی ئەبوو بەوەی پێی ڕازیە - واتە قورئان - ، وە تووڕە ئەبوو بەوەی کە پێی تووڕە ئەبێت) .

**٤٦ - سعد بن هشام** ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە عائشة رضوان الله علیها کە ئایا هەڵسوکەوت و ڕەفتاری پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو ؟

وتی : الله جل ثناؤە ئەفەرموویێت : ﴿ **وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ** ﴾ (القَلَمِ : ٤)، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری قورئان بوو) .

---

: واتە ئەمر و نەهیەکانی قورئانی جێبەجێ ئەکرد و بەپێی قورئان هەڵسوکەوتی ئەکرد.

**٤٧ - محمد بن كعب القرظي** ئەڵێت : (ئەمانزانی کەسێک خوێنەری قورئانە، یان ئەزانرا کەسێک خوێنەری قورئانە بە سپیهەڵگەڕان و زەردی ڕەنگی).

**٤٨ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرموویێت : (خوێنەری قورئان ئەبێت بە شەوەکەیدا بناسرێتەوە کاتێک خەڵکی خەوتوون، وە بە ڕۆژەکەی کاتێک خەڵکی بەڕۆژوو نین، وە بە گریانەکەی کاتێک خەڵکی پێئەکەنن، وە بە وەرعەکەی کاتێک خەڵکی تێکەڵی ئەکەن - واتە حەڵاڵ و حەرام - ، وە بە بێندەگیەکەی کاتێک خەڵکی ڕۆئەچن، وە بە خشوعەکەی کاتێک خەڵکی خۆیان لەلاگەورە ئەبێت، وە بە دڵتەنگیەکەی کاتێک خەڵکی دڵخۆشن) .

**٤٩ - سفیان بن عیینة** ئەڵێت : (هەرکەسێک قورئانی پێ بدرێت و چاو بگێرێت بۆ شتێک کە قورئان بە کەمی زانیوە، ئەوە پێچەوانەی قورئانی کردووە، ئایا گوێت لە وتەکەی نەبووە سبحانە وتعالی : ﴿ **وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي**

وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ * لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ | (الحِجْر : ٨٧ - ٨٨) .

| وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ | (طه : ١٣١)، واته قورئان .

| وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ | (طه : ١٣٢) .

| تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ | (السَّجْدَة : ١٦) .

٥٠ - سالم ی مولی ی أبي حذيفة ئاڵای موهاجیرەکانی هەڵگرتبوو لە ڕۆژی یەمامەدا، پێی وترا : (ئەترسین لێت) مەبەستیان ئەوەبوو پاشەکشێ بکات و هەڵبێت لە جەنگ .

فەرمووی : (جا ئەگەر وابێت من خراپترین هەڵگری قورئانم) .

---

: واتە ئەگەر من لەو قورئانەی ئەیخوێنمەوە و لەبەرمە ئەوەندە فێرنەبووبم کە لە جیهاددا نابێت هەڵبێم ئەوە من خراپترین خوێنەر و لەبەرکەری قورئانم .

٥١ - **عائشة** رضي الله عنها ئەفەرموويێت : (رسول الله ﷺ بە پێوە میزی نەکردووە لەوەتەی قورئانی لەسەر دابەزیوە ) .

٥٢ - **قتادة** ئەڵێت : (لەوەتەی قورئان ئەخوێنمەو تەرەپیازم نەخواردووە).

٥٣ - **يزيد بن أبي مالك** ئەڵێت : (دەمەکانتان ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی الله تعالى - **واتە بۆ خوێندنەوەی قورئان** -، جا ئەوەندەی ئەتوانن پاکی بکەنەوە، لەوەتەی قورئان ئەخوێنم پیازم نەخواردووە ) .

٥٤ - لە واصل بن أبي جميل لە **مجاهد** ـەوە كە (پێی ناخۆش بووە کەسێک بیەوێت شەونوێژ بکات و سیر و پیاز و تەرەپیاز بخوات ) .

٥٥ - لە عبدالعزیز بن أبي رواد لە **مجاهد** ـەوە كە نوێژی بکردایە و هەستی بە بۆنی - **دەمی** - بکردایە ئەوە دەستی لە قورئان خوێندنەوە هەڵئەگرت ) .

٥٦ - **مجاهد** ئەڵێت : (ئەگەر قورئانت ئەخوێندەوە و باوێشکت هات ئەوە دەست لە خوێندنەوە هەڵبگرە هەتا باوێشکەکەت نامێنێت ) .

٥٧ - **عكرمة** ئەڵێت : (ئەگەر یەکێکتان قورئانی ئەخوێندەوە و باوێشکی کرد ئەوە با بێدەنگ بێت، با بە دەم خوێندنەوەوە نەڵێت ها ها ها ) .

٥٩ - لە إبراهيم النخعي ـەوە لە **علي** ـەوە رضي الله عنه كە : (پێی خۆش نەبووە قورئان لە شتێکی بچووکدا بنووسرێت ) .

٦٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (بە قورئانەوە گەشت مەكەن ، چونكە ئەترسم بكەوێتە بەردەست دوژمنەكان ) .

٦١ - أبي بكر بن محمد بن عمرو بن حزم ئەڵێت : (رسول الله ﷺ بۆ باپیرەمی نووسی كە دەست نەدات لە قورئان ئیللا بە دەستنوێژەوە نەبێت ) .

٦٢ - لە نافع لە إبن عمر ـەوە كە : (دەستی نەدەدا لە موصحەف ئیللا بە دەستنوێژەوە نەبێت ) .

٦٣ - لە يحيى بن أبي كثير ـەوە لە مالك بن أنس ـەوە كە : (پێی خۆش نەبووە دەست بدرێت لە موصحەف ئیللا بە دەستنوێژەوە نەبێت ئەگەرچی موصحەفەكە لەناو بەرگ یاخود لەسەر سەرينیش بێت ) .

٦٤ - عاصم الأحول ئەڵێت : (پیاوێک لەلای أبي عالية وتی : سوورەتێكی بچووک ، یان وتی : سوورەتێكی كورت .

وتی : تۆ بچووكتریت لێی ، قورئان هەمووی گەورەیە ) .

٦٥ - عاصم ئەڵێت : (خالد الحذاء لەلای إبن سيرين وتی : سوورەتێكی خەفیف .

إبن سيرين وتی : لەكوێوە خەفیف ـە لەكاتێكدا الله تعالى ئەفەرمووێت : ﴿ إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾ (المُزَّمِّل : ٥) .

بەڵکو بڵێ: ئاسان، چونکە الله تعالى ئەفەرمووێت : | وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٍ | (القَمَر: ١٧).

٦٦ - الحسن البصري باسی سێ جۆر لە خوێنەرانی قورئان ئەکات، لە جۆری سێیەمدا ئەڵێت : (ئەوانەن کە دەستیان گەیشت بە چارەسەرەکانی قورئان و لەسەر دەردی دڵەکانیان دایاننا).

٦٧ - معضد ئەڵێت : (ئەگەر لەبەر گەرمی نیوەڕۆ و درێژی شەوی زستان و چێژی شەونوێژ بە کتێبی الله عز وجل ەوە نەبوویایە بە خەیاڵمدا نەئەهات یعسوب بێک بوومایە).

٦٨ - شجاع بن الوليد ئەڵێت : (ئافرەتێک چوویە لای مێردەکەی، پیاوەکە هەستایەوە و دەستی کرد بە نوێژ هەتا بەیانی کردەوە، وە تەماشای ئافرەتەکەی نەکرد، پاشان پیاوەکە دەربارەی ئەو کارەی سەرزەنشت کرا.

جا وتی : هەستام ئەو دوو ڕکعات سوننەتە بکەم کە پیاو ئەیکات پێش ئەوەی بڕواتە لای خێزانی، جا سەرقاڵی ئایەتە سەرسووڕهێنەرەکانی قورئان بووم هەتا لەبیرم چوویەوە).

٦٩ - لە عکرمة ەوە لە عبدالله بن عباس رضي الله عنه کە دەربارەی وتەی الله تعالى : | ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ | (البَقَرَة: ١٢١).

ئەفەرمووێت : (شوێنی ئەکەون بە شوێنکەوتنێکی حەق).

٧٠ - **عكرمة** ئەڵێت : (ئايا نابينيت كاتێک ئەڵێيت ' فلان يتلو فلاناً '، واتە شوێنی ئەكەوێت، | **وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا * وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا** | (الشَّمْسِ) .

واتە شوێنی ئەكەوێت .

٧١ - **إبن جريج** دەربارەی فەرمايشتی الله تعالی ئەڵێت : | **يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ** | (النِّسَاءِ)، واتە قورئان .

| **فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُواْ بِهِۦ** | (النِّسَاءِ)، واتە بە قورئان .

٧٢ - **الشعبي** دەربارەی ئايەتی : | **فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ** | (آل عمران : ١٨٧) ئەڵێت : (لەبەردەستياندا بوو، بەڵام وازيان لە كارپێكردنی هێنا) .

٧٣ - **عامر بن مطر** ئەڵێت : (حذيفة بن اليمان خەڵكێكی زۆری بينی، فەرمووی : ئەی عامر بن مطر، چی ئەكەيت ئەگەر خەڵكی ڕێگايەكيان گرتەبەر، وە قورئانيش ڕێگايەک، ئايا لەگەڵ كاميماندا ئەبيت ؟

وتم : لەگەڵ قورئاندا ئەبم، لەگەڵی ئەژيم و زيندوو ئەبمەوە) .

٧٤ - **جبلة بن سحيم** وتی : (سلمان بە زيد بن صوحان ی وت : چی ئەكەيت ئەگەر قورئان و سوڵتان جەنگان ؟ **- واتە سوڵتان پێچەوانەی قورئان هەڵسوكەوتی كرد -**

وتی : لەگەڵ قورئان ئەبم) .

٧٥ - أبي الزاهرية ئەڵێت : پیاوێک منداڵەکەی هێنا بۆ لای أبو الدرداء و وتی : ئەی أبو الدرداء ئەم منداڵەم قورئانی کۆکردووەتەوە - واتە هەمووی لەبەرە -

جا فەرمووی : اللهم لێی خۆشبە ، بەڕاستی کەسێک قورئانی کۆکردووەتەوە کە گوێبیستی ئەبێت و گوێڕایەڵی ئەکات ) .

٧٦ - الحسن البصري ئەڵێت : (ئەولاترین و لەپێشترین کەس بەم قورئانە ئەو کەسەیە کە شوێنی ئەکەوێت ئەگەرچی نەشیخوێنێتەوە ) .

٧٧ - أبو صالح السمان ئەڵێت : (کاتێک ئەهلی یەمەن لە خەلافەتی أبو بکر دا رضي الله عنه هاتن، کە قورئانیان بیست گریان، أبو بکر الصدیق فەرمووی : ئێمەش وابووین، دواتر دڵەکان ڕەق بوون ) .

٧٨ - عبيد بن عمير ئەڵێت : (عمر بن الخطاب نوێژی بەیانی بۆ کردین، جا دەستی کرد بە سوورەتی یوسف و خوێندیەوە هەتا گەیشتە : | وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٌ | (یُوسُف : ٨٤)، گریا هەتا هەناسەی لێ بڕا، دواتر چووە ڕکوع ـەوە ) .

٧٩ - أبو عبيد ئەڵێت : (وە ئەگێڕدرێتەوە کاتێک گەیشتووەتە فەرمایشتی سبحانه وتعالى : | إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ | (یُوسُف : ٨٦)، گریاوە هەتا نَشیج ی بیستراوە لە ڕیزەکانی دواوە ) .

أبو عبيد ئەڵێت : (نَشيج ی پیاوێكی گەورە وەكو گریانی منداڵێك وایە كاتێك لێی ئەدرێت و گریانەكەی ئەخواتەوە و دەریناخات) .

٨٠ - عبدالأعلى التيمي ئەڵێت : (هەركەسێك زانستێكی پێ بدرێت و نەیگریەنێت ئەوە شایەنی ئەوە نییە زانستێكی بەسوودی پێ بدرێت) .

٨١ - له هلال الوزان ـەوە لە عبدالرحمن بن أبي ليلى ـەوە كە : (سورەتی مریم ی خوێندەوە هەتا گەیشتە سوجدە : | خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ | (مَرْيَم : ٥٨) .

سوجدەی برد، كاتێك سەری بەرز كردەوە لە سوجدە وتی : ئەوە سوجدەكە بوو كە بردمان، ئەی گریانەكە كوا ؟!) .

٨٢ - حذيفة بن اليمان رضي الله عنه ئەفەرموویێت : (شەوێك لەگەڵ رسول الله ﷺ نوێژم كرد، كاتێك بە ئایەتی ڕەحمەتدا تێبپەڕیایە داوای ئەكرد، وە كاتێك بە ئایەتی سزادا تێبپەڕیایە پەنای ئەگرت، وە كاتێك تێبپەڕیایە بە ئایەتێكدا كە پاكڕاگیرانی الله سبحانە وتعالی ی تێدایە ئەوە سبحان الله ی ئەكرد).

٨٣ - عوف بن مالك ئەڵێت : (شەوێكیان لەگەڵ رسول الله ـدا ﷺ شەونوێژم كرد، سیواكی كرد، پاشان دەستنوێژی كرد، دواتر وەستا نوێژی كرد، منیش وەستام لەگەڵی، بە البقرة دەستی پێ كرد، بە هیچ ئایەتێكی ڕەحمەتدا تێنەئەپەڕی ئیللا ئەوەستا و داوای ئەكرد، وە بە هیچ ئایەتێكی سزادا تێنەپەڕی ئیللا ئەوەستا و پەنای ئەگرت، پاشان آل عمران ی خوێندەوە، دواتر سورەتی النساء خوێندەوە، بە هەمان شێوەی ئەكرد) .

٨٤ - أبي ليلى ئەڵێت : (رسول الله ﷺ نوێژی ئەكرد، ئەگەر بە ئایەتێكدا تێبپەڕیایە كە باسی ئاگری تێدابووایە ئەیفەرموو : پەنا ئەگرم بە الله لە ئاگر) .

٨٥ - لە موسى بن أنس ەوە لە باوكیەوە أنس بن مالك كە : (كاتێك بە ئایەتێكدا تێبپەڕیایە كە باسی ئاگری تێدابووایە لەسەری ئەوەستا و دوعای ئەكرد) .

٨٦ - عبدالوهاب بن يحيى بن حمزة لە باوكیەوە، لە باپیریەوە كە ئەڵێت : (أسماء ی كچی أبو بكر دەستی كرد بە خوێندنەوەی سورەتی الطور لە نوێژدا، كاتێك گەیشتە فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾ (الطُّور : ٢٧) من ڕۆیشتم بۆ بازاڕ بۆ پێویستیەك و كاتێك هاتمەوە هەر ئەمەی دووبارە ئەكردەوە ﴿ وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾ ) .

٨٧ - القاسم بن أبي أيوب ئەڵێت : (گوێبیستی سعيد بن جبير بووم لە نوێژدا ئەم ئایەتەی بیست و شتێك جار دووبارە كردەوە : ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ (البَقَرَة : ٢٨١) .

٨٨ - مجاهد بن جبر دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى ﴿ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾ (المُزَّمِّل : ٤) .

ئەڵێت : (بە جوانی و هێمنی) .

٨٩ - له يعلى بن مملك له **أم سلمة** ـهوه كه : (وەسفی خوێندنەوەی رسول الله ی ﷺ كرد به خوێندنەوەیەكی وشه به وشەی ڕوون) .

٩٠ - **أم سلمة** رضي الله عنها فەرمووی : (رسول الله ﷺ له خوێندنەوەیدا ئەوەستا : | **بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ** (١) **ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ** (٢) **ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ** (٣) **مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ** (٤) | ) .

---

: واته ئایەتەكانی بەسەر یەكەوه نەئەوت، بەڵكو نێوانی تێئەكردن و ئەوەستا .

٩١ - **إبراهيم النخعي** ئەڵێت : (علقمة قورئانی خوێندەوه بەسەر عبدالله بن مسعود دا، وەک بڵێی پەلەی كرد، عبدالله وتی : (دایک و باوكم فیدات بن، به هێمنی بیخوێنەرەوه، چونكه ئەوه جوانیی قورئانه)، وه علقمة دەنگی بۆ قورئان خۆش بوو) .

٩٢ - **أبي حمزة** ئەڵێت : (وتم به إبن عباس : من به خێرایی قورئان ئەخوێنمەوه، وه من له سێ ڕۆژدا خەتمێک ئەكەم .

وتی : ئەگەر له شەوێكدا البقرة به هێمنی بخوێنمەوه و تێیڕابمێنم پێم خۆشتره لەوەی بەو شێوەیه بیخوێنمەوه كه تۆ ئەیڵێیت) .

٩٣ - عبيد المكتب ئەڵێت: (وتم بە مجاهد: پیاوێک البقرة و آل عمران ی خوێندووەتەوە، وە پیاوێک البقرة ی خوێندووەتەوە، هێندەی یەک وەستاون، وە سوجدە و ڕکوع و دانیشتنەکانیان هێندەی یەک بووە، کامیان باشترە؟

وتی: ئەوەی البقرة ی خوێندووەتەوە، ﴿وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا﴾ (الإسراء: ١٠٦).

٩٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویێت: (قورئان بڕازێننەوە بە دەنگەکانتان).

٩٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویێت: (الله بیستنی خۆی بۆ هیچ شتێک ڕانەگرتووە بە هاوشێوەی ڕاگرتنی بیستنی بۆ پێغەمبەر کە قورئان بە دەنگی بەرز ئەخوێنێتەوە).

٩٦ - أبو هريرة رضي الله عنه ئەڵێت: (رسول الله ﷺ هاتە مزگەوتەوە، گوێی لە خوێندنەوەی پیاوێک بوو، فەرمووی: ئەوەی کێیە؟

وترا: عبدالله بن قیس.

فەرمووی: مزامیر ی آل داود ی پێدراوە).

---

: واتە دەنگی خۆشە، عبدالله بن قیس أبو موسى الأشعري یە رضي الله عنه.

**٩٧ - أبو سلمة** ئەڵێت : (ئەگەر عمر بن الخطاب أبو موسى ی ببینیایە پێی ئەوت : ئەی أبا موسی پەروەردگارمان بیر بخەرەوە .

ئەویش لەلای قورئانی ئەخوێندەوە ) .

**٩٨ - أبو عبدالرحمن الحبلي** ئەڵێت : (عقبة بن عامر كە خۆشترین دەنگی هەبوو بۆ قورئان خوێندنەوە وتی : عمر وتی : ئەی عقبة سوورەتێكم بەسەردا بخوێنرێتەوە .

وتی : | **بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ** | (التَّوْبَة : ١) بەسەردا خوێندەوە ) .

**٩٩ - طاوس** وتی : پرسیار كرا لە رسول الله ﷺ كێ باشترین و خۆشترین دەنگی هەیە بۆ قورئان خوێندنەوە ؟

فەرمووی : (ئەوەی كە گوێت لێبوو بزانیت كە لە الله تعالی ئەترسێت ) .

**١٠٠ - طاوس** ئەڵێت : (ئەو كەسەی كە زۆرترین ترسی هەیە لە الله خاوەنی باشترین و خۆشترین دەنگە بۆ خوێندنەوەی قورئان ) .

**١٠١ - أبو عبيد** ئەڵێت : یحیی بن سعید هەواڵی پێدام لە شعبة ەوە وتی : أیوب ڕێگری لێ كردم لەوەی فەرموودەی (قورئان بڕازێننەوە بە دەنگەكانتان) بگێڕمەوە .

**أبو عبيد** ئەڵێت : (ئەوەندەی كە ئەزانین أیوب پێی ناخۆش بوو كە خەڵكی بەم فەرموودەیە ئەو ڕوخسەتەی رسول الله ﷺ ئەقۆزنەوە بۆ ئەم ئاوازە داهێنراوانە ) .

---

**: واتە لەبەر ئەوەی گومڕاكان ئەو فەرموودەیەیان بەكارهێناوە بۆ مەبەستی خراپی خۆیان أیوب السختیاني پێی خۆش نەبووە لەلای هەموو كەسێكدا باسی ئەو فەرموودەیە بكرێت، والله أعلم .**

**١٠٢ - البياضي** ئەڵێت : (رسول الله ﷺ تێپەڕی بەلای خەڵكیدا كاتێك نوێژیان ئەكرد، جا دەنگیان بەرز بوو، ئەویش فەرمووی : (بەڕاستی نوێژكەر لەگەڵ پەروەردگاری خۆی ئەدوێت، جا با ئاگای لەوە بێت كە لەگەڵی پێی ئەدوێت، وە با هیچ كەسێكتان دەنگی قورئان خوێندنی بەرز نەكاتەوە بەسەر ئەوی دیكەتاندا) .

**١٠٣ - لە سعيد بن جبير** ەوە كە : (پیاوێك نوێژی ئەكرد لە نزیك إبن عمر، قورئانی بە دەنگی بەرز ئەخوێند بە ڕۆژدا، جا یەكێك لە دانیشتووەكان لەگەڵ إبن عمر دا وتی : ئەم گێژە بێ عەقڵە نازانێت نوێژ چییە .

إبن عمر پێی فەرموو : (لەوانەیە تۆ عەقڵت نەبێت، چۆن كەسێك كە قورئان بخوێنێتەوە پێی ئەڵێیت عاقڵ نییە!) .

كاتێك پیاوەكە تەواو بوو لە نوێژەكەی إبن عمر بانگی كرد و فەرمووی : (خوێندنەوە لە ڕۆژدا ئەشاردرێتەوە) .

١٠٤ - **لقمان بن عامر** ئەڵێت : (پیاوێک لە تەنیشت أبو مسلم الخولاني نوێژی کرد، جا بە دەنگی بەرز قورئانی خوێندەوە، کاتێک أبو مسلم تەواو بوو لە نوێژەکەی وتی : ئەی کوڕی برام، لە من و خۆشت تێکدا) .

١٠٥ - لە **إبن سيرين** وە کە ئەڵێت : (لە خوێندنەوەی ڕۆژدا با خۆت گوێت لە خۆت بێت) .

---

: واتە دەنگت بەرز مەکەرەوە لەکاتی قورئان خوێندن، با تەنها خۆت خوێندنەوەکەی خۆت ببیستیت .

١٠٦ - **عبدالله بن أبي قيس** وتی : پرسیارم کرد لە عائشة رحمه الله : خوێندنەوەی رسول الله ﷺ چۆن بوو؟ ئایا بە دەنگی نزم ئەیخوێندەوە؟ یان بە دەنگی بەرز؟

فەرمووی : (هەموو ئەوانەی ئەکرد، هەندێک جار بە دەنگی نزم ئەیخوێند، وە هەندێک جار بە دەنگی بەرز) .

منیش وتم : حمد بۆ ئەو الله یەی فراوانی لە بابەتەکەدا داناوە .

---

: (فراوانی لە بابەتەکەدا داناوە) واتە ئاسانکاری کردووە .

١٠٧ - علقمة ئەڵێت : (شەوێک لەلای عبدالله مامەوە، وتیان : قورئان خوێندنەکەی چۆن بوو ؟

وتم : ئەهلی ماڵەکە ئەیانبیست) .

١٠٨ - أبي بكر بن حزم وتی : (عمرة شەوێکیان لەلامان مایەوە بەهۆی ئەوەی نەخۆشێکمان هەبوو، منیش شەو هەستام بۆ نوێژ کردن، کاتێک بەیانیم کردەوە لێی پرسیم : چی ڕێگری لێ کردیت لە دەنگ بەرز کردنەوە ؟ هیچ شتێک خەبەری نەئەکردینەوە لە خەوی شەو ئیللا خوێندنەوەی معاذ القارئ و أفلح ی مەولای أبي أيوب نەبێت) .

١٠٩ - لە إبن سيرين ـەوە لە إبن عمر ـەوە رضي الله عنه كە : (لە یەک ڕکاتدا دە سوورەتی ئەخوێندەوە) .

١١٠ - لە نافع لە إبن عمر ـەوە رضي الله عنه كە : (لە یەک ڕکاتی نوێژی فەرزدا دوو و سێ وە چوار سوورەتی ئەخوێندەوە) .

١١١ - لە قيس بن أبي صعصعة ـەوە کە بە رسول الله ی ﷺ وتووە : ئەی رسول الله، لە چەند ڕۆژدا قورئان بخوێنمەوە ؟

فەرمووی : (لە هەموو پانزە ڕۆژێکدا) .

وتی : من لەوە توانام زیاترە .

فەرمووی : (کەوایە هەموو جومعەیەک) .

: واتە یەک هەفتە، لە جومعەیەک تا جومعەیەکی تر .

١١٢ - عبدالحمن بن عبدالله بن مسعود وتی : (عبدالله بن مسعود لە بێجگە لە ڕەمەزاندا قورئانی خەتم ئەکرد لە جومعەوە بۆ جومعە) .

١١٣ - أبي مهلب وتی : (أبي بن كعب لە هەشت ڕۆژدا قورئانی خەتم ئەکرد).

١١٤ - أبي قلابة وتی : (أبي بن كعب لە هەموو هەشت ڕۆژێکدا قورئانی خەتم ئەکرد، وە تميم الداري خەتمی ئەکرد لە هەموو حەوت ڕۆژێکدا) .

١١٥ - لە الأعمش ـەوە لە إبراهيم النخعي يەوە کە : (لە هەموو حەوت ڕۆژێکدا قورئانی خەتم ئەکرد) .

١١٦ - إبراهيم النخعي ئەڵێت : (الأسود قورئانی خەتم ئەکرد لە شەش ڕۆژدا، وە علقمة خەتمی ئەکرد لە پێنج ڕۆژدا) .

١١٧ - لە سعد بن المنذر الأنصاري ـەوە کە وتوویەتی : ئەی رسول الله ئایا قورئان بخوێنمەوە لە هەموو سێ ڕۆژێکدا ؟

فەرمووی : (بەڵێ، ئەگەر ئەتوانیت) .

جا بەوشێوەیە ئەیخوێندەوە هەتا وەفاتی کرد .

١١٨ - **عبدالحمن بن عبدالله بن مسعود** لە باوكیەوە كە : (لە ڕەمەزاندا لە سێ ڕۆژدا قورئانی خەتم كردووە) .

١١٩ - **إبراهيم النخعي** ئەڵێت : (الأسود لە مانگی ڕەمەزادا لە هەموو دوو شەوێكدا قورئانی خەتم ئەكرد) .

١٢٠ - **إبن سيرين** وتی : نائلة بنت الفرافصة الكلبية كاتێک چوونەسەر عثمان رضي الله عنه بۆ كوشتنی، وتی : (ئەگەر بیكوژن یان وازی لێ بهێنن ئەوە شەوی زیندوو كردووەتەوە بە یەک ڕكات و هەموو قورئانی تێدا ئەخوێند) .

---

: نائلة بنت الفرافصة خێزانی عثمان بن عفان ە رضي الله عنهم .

١٢١ - لە **إبن سيرين** ـەوە كە : (تميم الداري لە یەک ڕكاتدا هەموو قورئانی خوێندووەتەوە) .

١٢٢ - **سعيد بن جبير** وتی : (لە كەعبە هەموو قورئانم خوێندەوە لە یەک ڕكاتدا) .

١٢٣ - **خيثمة** وتی : چوومە بۆ لای عبدالله بن عمرو وە المصحف ی ئەخوێندەوە، پرسیارم لێكرد دەربارەی، فەرمووی : (ئەمە ئەو بەشەیە كە بە شەو ئەیخوێنمەوە) .

١٢٤ - **قيس بن أبي حازم** ئەڵێت : خالد بن الوليد رضي الله عنه فەرمووی : (بەڕاستی جیهادکردن لەپێناو الله سەرقاڵی کردم لەوەی زۆر قورئان بخوێنمەوە).

١٢٥ - **إبن عون** ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە إبن سيرين دەربارەی پیاوێک کە لە سوورەتێکدا دوو ئایەت ئەخوێنێتەوە، پاشان وازی لێ ئەهێنێت و ئەڕواتە سەر سوورەتێکی تر، پاشان واز لەوەش ئەهێنێت و ئەڕواتە سەر سوورەتێکی تر.

وتی : با هەریەکێکتان بترسێت لەوەی کە تاوانێکی زۆری بۆ بنووسرێت لەکاتێکدا ئاگای لێ نییە) .

١٢٦ - علي رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (رسول الله ﷺ قورئانی بۆ ئەخوێندینەوە لەسەر هەموو حاڵەتێک تەنها لە جەنابەتدا نەبێت) .

١٢٧ - **إبن سيرين** ئەڵێت : (عمر بن الخطاب قورئانی خوێند کاتێک دەرچوو لە سەرئاو، أبو مريم الحنفي پێی وت : قورئان ئەخوێنیت و دەستنوێژت نییە ؟

فەرموو : ئایا موسەیلەمە - ی کەذاب - فتوای بۆ داوی بەوە ؟

---

: واتە لە بێدەستنوێژیدا مرۆڤ ئەتوانێت قورئان بخوێنێت، بەڵام تەنها بە دەستنوێژەوە ئەتوانێت دەست بدات لە موصحەف، وە لە کاتی جەنابەت و سووڕی مانگانەدا مرۆڤ ناتوانێت نە دەست بدات لە قورئان، وە نە بیخوێنێتەوە، والله أعلم .

١٢٨ - علقمة و الأسود ئەڵێن : (هاتن بۆ لای سلمان - الفارسي -، قورئانی بۆ خوێندینەوە و تازە لە سەرئاو دەرچووبوو) .

١٢٩ - أبان وتی : (خەڵكانێک لە ئەهلی بەسرە قورئانیان نەئەخوێندەوە ئیللا كاتێک نەبێت دەستنوێژیان هەبووایە، یەكێک لەوانە عسعس بن سلامة بوو وتی : لە عەرەفە گەیشتم بە إبن عمر پرسیارم لێ كرد : ئایا پیاو قورئان ئەخوێنێتەوە لەكاتێكدا ئاوی ڕشتبێت ؟

فەرمووی : ئاو ڕشتن چییە ؟ بڵێ میز كردن .

وتم : میزكردن .

فەرمووی : بەڵێ) .

١٣٠ - لە سعید بن جبیر ـەوە لە إبن عباس و إبن عمر ـەوە كە : (بەشی خۆیان لە قورئان ئەخوێندەوە دوای ئەوەی لە سەرئاو دەرئەچوون پێش دەستنوێژ گرتن) .

١٣١ - لە عبدالله بن مالک الغافقي كە گوێبیستی رسول الله ﷺ بووە بە عمر ی فەرمووە : (ئەگەر لە جەنابەتدا بم و دەستنوێژ بگرم، ئەوە ئەخۆم و ئەخۆمەوە، وە نوێژ ناكەم و قورئان ناخوێنمەوە هەتا غوسل دەرنەكەم) .

---

: سوننەتە هەركاتێک كەسێک تووشی جەنابەت بوو و نەیتوانی یەكسەر غوسل دەربكات، ئەوە با دەستنوێژ بگرێت ئینجا بخەوێت، یان بخوات و بخواتەوە، والله أعلم .

**١٣٢** - له عبيدة السلماني ـەوه له **عمر** ـەوه كه ئەڵێت : (من ڕقم لەوەیه کەسێک که جەنابەتی هەیه شتێک له قورئان بخوێنێتەوە) .

**١٣٣** - **أبي الغريف** وتی : پرسیار کرا له علي دەربارەی کەسێک که جەنابەتی هەیه، ئایا قورئان ئەخوێنێت ؟

فەرمووی : (نەخێر، تەنانەت یەک پیتیش) .

**١٣٤** - **سعيد بن جبير** ئەڵێت : (کەسێک که جەنابەتی هەیه هیچ شتێک له قورئان ناخوێنێتەوە) .

---

: به هەمان شێوە ئافرەتێک که له سووڕی مانگانەدا بێت .

**١٣٥** - **حبيب المعلم** ئەڵێت : پرسیارم کرد له الحسن وتم : ئایا قورئان فێری منداڵانی ئەهلی ذیممە بکەم ؟

وتی : (بەڵێ، مەگەر تەورات و ئینجیل ناخوێننەوە لەکاتێکدا کتێبی الله عز وجل ن ؟) .

**١٣٦** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ڕقم له قورئانخوێنێکه ببینم قەڵەو بووبێت و قورئانی لەبیرچووبێتەوە) .

١٣٧ - الضحاك بن مزاحم ئەڵێت : (هیچ كەسێک نییە قورئان فێر ببێت و پاشان لەبیری بچێتەوە ئیللا بەهۆی تاوانێکەوەیە کە ئەنجامی داوە، چونکە الله عز وجل ئەفەرمووێت : | وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ | (الشُّورَىٰ : ٣٠) .

وە لەبیرچوونەوەی قورئان لە گەورەترین موسیبەتەکانە) .

١٣٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (قورئان بخوێنن، وە زیادەڕەوی تێدا مەکەن، وە لێی لامەدەن، وە پێی مەخۆن، وە پێی زۆر مەکەن) .

---

: (وە پێی مەخۆن، وە پێی زۆر مەکەن) واتە مەیکەن بە هۆکاری بەدەستهێنانی دنیا و زۆرکردنی .

١٣٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (فێری قورئان ببن و داوا لە الله بکەن پێی پێش ئەوەی کۆمەڵێک فێری ببن و داوای دنیا بکەن پێی، چونکە قورئان سێ کەس فێری ئەبێت : کەسێک خۆی پێ هەڵئەکێشێت، وە کەسێک بەهۆیەوە ئەخوات، وە کەسێک لەپێناو الله عز وجل ئەیخوێنێتەوە) .

١٤٠ - أبو الدرداء رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (أبي بن کعب سوورەتێکی بۆ پیاوێکی ئەهلی یەمەن خوێندەوە، بینی کەوانێکی پێیە، پێی وت : پێم بفرۆشە.

پێی وت : نەخێر، بەڵکو ئەوە بۆ تۆ .

دواتر پرسیاری كرد لە رسول الله ﷺ دەربارەی، فەرمووی : ئەگەر ئەتەوێت كەوانێک لە ئاگر بكەنە ملت ئەوە وەریگرە ) .

١٤١ - أبو إسحاق السبيعي ئەڵێت : (مصعب بن الزبير فەرمانی بە عبدالله بن المغفل كرد كە بەرنوێژی بۆ خەڵكی بكات لە مانگی ڕەمەزاندا، دوای مانگی ڕەمەزان پێنسەد درهەم و پارچە ئاڵتونێكی بۆ نارد، جا ڕەتی كردەوە و فەرمووی : لەسەر قورئان پاداشت وەرناگرم ) .

١٤٢ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرموويێت : (سەردەمێک دێت بە قورئان داواتان لێ ئەكرێت، جا كە داوایان لێ كردن پێیان مەدەن ) .

---

**: واتە خەڵكانێک بە خوێندنەوەی قورئان داوای پێگە و پارە ئەكەن، وەكو بەشێک لەو قورئان خوێنانەی ئێستا كە تەنها بۆ دنیا هەوڵ ئەدەن .**

١٤٣ - الحسن البصري ئەڵێت : (ئەم قورئانە كۆمەڵە بەندە و مندالانێک فێری بوون كە لە شوێنی ڕاستی خۆیەوە فێری نەبوون، وە نازانن لێكدانەوەكەی چییە ، الله تعالى ئەفەرموويێت : | كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ | (ص : ٢٩) .

ڕۆچوون و بیركردنەوە لە ئایەتەكاندا چییە جگە لە شوێنكەوتنی بە زانستەوە ؟ وە لەپێشترین كەس بەم قورئانە ئەوەیە كە شوێنی ئەكەوێت، ئەگەرچی نەشیخوێنێتەوە .

دواتر یەکێکتان ئەڵێت : وەرە فڵانە کەس با پێشبڕکێ بکەین لە خوێندنەوەی قورئاندا!

کەی قورئان خوێنەکان کاری وایان کردووە ؟! ئەوانە نە خوێنەری قورئانن ، وە نە زانا و دانا ن، الله هاوشێوەی ئەوانە لەناو خەڵکیدا زۆر نەکات ) .

١٤٤ - أبا حازم وتی : إبن عمر بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە کەوتبوو وە خەڵکی لە دەوروبەری کۆبووبوونەوە، فەرمووی : (ئەوە چییە ؟)

وتیان : کاتێک قورئانی بەسەردا بخوێنرێتەوە یان ببیستێت یادی الله ئەکرێتەوە ئەبوورێتەوە لە ترسی الله .

إبن عمر فەرمووی : (سوێند بە الله ئێمە لە الله ئەترسین و وە ناشبوورێینەوە ) .

١٤٥ - عکرمة ئەڵێت : (پرسیار کرا لە أسماء - بنت أبي بكر الصديق - ئایا هیچ کەسێک لە سەلەف لە ترسدا ئەبوورایەوە ؟

فەرمووی : نەخێر، بەڵکو ئەگریان ) .

١٤٦ - هشام بن حسان وتی : وترا بە عائشة : کۆمەڵێک هەن کاتێک قورئان ئەخوێنرێتەوە ئەبوورێنەوە .

فەرمووی : قورئان بەرێزترە لەوەی عەقڵی پیاوان ببات - واتە بیانبوورێنێتەوە -، بەڵکو بەو شێوەیەیە کە الله عز وجل فەرموویەتی : ﴿ تَقْشَعِرُّ

مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾ (الزُّمَر : ٢٣) .

١٤٧ - له قتادة ـەوە له أنس بن مالك ـەوە كه پرسیاری لێكراوە دەربارەی كۆمەڵەیەک كاتێک قورئانیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە ئەبوورێنەوە ؟

فەرمووی : (ئەوە ئیشی خەوارجیەكانە) .

١٤٨ - حمران بن عبدالعزيز و جرير بن حازم بیستیان محمد بن سیرین پرسیاری لێكرا دەربارەی كەسێک كاتێک قورئانی لەپاڵدا ئەخوێنرێتەوە ئەبوورێتەوە ؟

وتی : (بەڵێنی نێوان ئێمە و ئەو بریتیە لەوەی لەسەر دیوارێک بووەستێن و پاشان قورئانی بەسەردا بخوێنرێتەوە لە سەرەتاوە تا كۆتایی، جا ئەگەر بوورایەوە ئەوە بەو شێوەیەیە كە خۆی ئەڵێت) .

---

**: واته ئەگەر ڕاستگۆیە و لە ترسی الله عز وجل ئەبوورێتەوە بیخەنە سەر دیوارێک ئینجا قورئانی بەسەردا بخوێننەوە، ئەگەر لەو حاڵەتەدا بوورایەوە و كەوتە سەر زەویەكە ئەوە ڕاست ئەكات .**

١٤٩ - الحارث العكلي وتی : (الشعبي پێی وتم : نامەكەی رسول الله ﷺ بۆ ئێوە چۆن بوو ؟

وتم : باسمک اللهم .

وتی : ئەوە نامەی یەکەم بوو کە پێغەمبەر ﷺ نووسی (باسمک اللهم)، جا هێندەی الله ویستی لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، پاشان ئەمە دابەزی : ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ ﴾ (هُود : ٤١)، جا نووسی (بسم الله) .

هێندەی الله ویستی لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، پاشان ئەمە دابەزی : ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ ﴾ (الإِسۡرَاء : ١١٠)، جا نووسی (بسم الله الرحمن) .

هێندەی الله ویستی لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، پاشان ئەمە دابەزی : ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (النَّمۡل : ٣٠) .

١٥٠ - **سعید بن المسیب** وتی : کاتێک نامەی پێغەمبەر ﷺ گەیشت بە قەیسەر خوێندیەوە و وتی : (ئەم نامەیەم نەبینیوە لە پاش سلیمان بن داود ـەوە ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (النَّمۡل : ٣٠) .

---

: واتە نووسرابوو ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ .

١٥١ - **إبن جریج** ئەڵێت : (سلیمان بن داود تەنها ئەوەندەی نووسیبوو لە نامەکەی کە الله دەربارەی ئەگێڕێتەوە : ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ (٣١) ﴾ (النَّمۡل) .

١٥٢ - كعب الأحبار ئه‌ڵێت : يه‌كه‌م شت كه‌ له‌ ته‌ورات دابه‌زى بريتيبوو له‌ ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾ (الأنعام : ١٥١) .

١٥٣ - سعيد بن جبير وتى : (له‌ سه‌رده‌مى پێغه‌مبه‌ردا ﷺ نه‌يانئه‌زانى سووره‌تێک ته‌واو بووه‌ هه‌تا ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئه‌هاته‌ خواره‌وه‌، جا كه‌ دابه‌زيايه‌ ئه‌يانزانى سووره‌تێک ته‌واو بووه‌ و دانه‌يه‌كى تر دابه‌زيوه‌) .

١٥٤ - محمد بن كعب القرظي ئه‌ڵێت : (فاتيحه‌ى قورئان حه‌وت ئايه‌ته‌ به‌ ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ـه‌وه‌) .

١٥٥ - إبن شهاب الزهري ئه‌ڵێت : (هه‌ركه‌سێک واز له‌ ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ بهێنێت وازى له‌ ئايه‌تێكى كتێبى الله هێناوه‌) .

١٥٦\أ - إبن جريج وتى : وتم به‌ باوكم ئايا سعيد بن جبير هه‌واڵى پێدايت كه‌ إبن عباس فه‌رموويه‌تى ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئايه‌تێكه‌ له‌ قورئان ؟

وتى : (به‌ڵێ) .

١٥٦\ب - لە نافع ـەوە لە إبن عمر ـەوە كە : (وازى لە وتنى | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ | نەئەهێنا هەتا سورەتى دواى ئەوەى ئەخوێند) .

---

**: مەبەست ئەوەيە كاتێک لە سورەتێک تەواو بوويت و ويستت دەست بكەيت بە سورەتێكى تر ئەوە لە سەرەتادا بڵێ | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ | وەک چۆن لە ئێستادا لە هەموو موسحەفەكان نووسراوە، ئەمە لەكاتى خوێندنەوەى قورئاندايە، بەڵام لەكاتى نوێژدا ئەبێت | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ | ى سوورەتەكان بە نهێنى بخوێنيت ئەگەر نوێژەكە قورئانى تێدا جەهر ئەكرا وەكو نوێژى بەيانى و مەغريب و عيشا، والله أعلم .**

١٥٧ - إبن عون ئەڵێت : (نافع وازهێنان لە | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ | ى بەلاوە گەورە بوو) .

١٥٨ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه لە دەربارەى ئايەتى : | وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي | (الحِجْر : ٨٧)

ئەفەرموويێت : (ئەوەى فاتيحەى قورئانە) .

١٥٩ - سعيد بن جبير وتى پرسيارم كرد لە إبن عباس دەربارەى فەرمايشتى | وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي | .

فەرمووی : (ئەوە أُم ی قورئانە، الله عز وجل تایبەتی کردووە بە ئوممەتی محمد ﷺ، بۆی هەڵگرتبوون هەتا دەریکرد و پێی بەخشین، وە پێش ئوممەتی محمد ﷺ بە کەسی تری نەداوە).

١٦٠ - محمد بن كعب القرظي دەربارەی فەرمایشتی | وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ | (الحِجْر : ٨٧)

ئەڵێت : (ئەوە فاتیحەی قورئانە).

---

: واتە سورەتی فاتیحە .

١٦١ - مكحول ئەڵێت : (أُم ی قورئان بریتیە لە خوێندنەوە و داوا و دوعاکردن).

١٦٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (الله عز وجل ئەفەرمووێت : نوێژم دابەش کردووە بۆ دوو بەش لە نێوان خۆم و بەندەکەم، نیوەی بۆ منە، وە نیوەی بۆ ئەوە، وە بەندەکەم ئەوەی بۆ هەیە کە داوای ئەکات، بەندە ئەوەستێت بۆ نوێژ و ئەڵێت : | ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ | .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : (بەندەکەم سوپاسی کردم).

بەندە ئەڵێت : | ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ | .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : (بەندەکەم وەسفی کردم).

بەندە ئەڵێت : ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : (بەندەکەم بەرز ڕایگرتم) .

بەندە ئەڵێت : ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : (ئەوە لە نێوان من و بەندەکەمدایە، سەرەتاکەی بۆ منە، کۆتاییەکەی بۆ بەندەکەمە، وە ئەوەی داوای بکات پێی ئەبەخشم) .

بەندە ئەڵێت : ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ * صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : (ئەمە بۆ بەندەکەمە، وە ئەوەی بەندەکەم داوای بکات پێی ئەبەخشم) .

**١٦٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن و مەیانکەن بە گۆڕستان، وە دەنگەکانتان خۆش بکەن بە قورئان، چونکە شەیتان لە ماڵێک هەڵدێت کە سورەتی البقرة ی تێدا ئەخوێنرێت) .

**١٦٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (شەیتان لە ماڵێک ئەڕواتە دەرەوە ئەگەر ببیستێت سورەتی البقرة ی تێدا ئەخوێنرێت) .

**١٦٥** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (شەیتان لە ماڵێک هەڵدێت کە دەنگی خوێندنی سورەتی البقرة ی تێدا ببیسترێت) .

**١٦٦ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت: (**البقرة بخوێنن، چونکە خوێندنی بەرەکەتە، وە وازهێنان لێی پەشیمانی و حەسرەتە**).

**١٦٧ - الشعبي** ئەڵێت: (مسروق بن الأجدع و شتير بن شكل گەیشتن بە یەک، شتیر بە مسروق ی وت: یان من لە عبدالله ـەوە شتێکت بۆ بگێڕمەوە و بەڕاستم بخەرەوە، یاخود تۆ بیگێڕەوە و بەڕاستت ئەخەمەوە.

مسروق وتی: بیگێڕەوە و بەڕاستت ئەخەمەوە.

شتیر وتی: گوێبیستی عبدالله بووم وتی: الله لە ئاسمان و زەوی و بەهەشت و جەهەننەمدا دروستی نەکردووە گەورەتر بێت لە ئایەتێکی سورەتی البقرة: | **ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ** | (البَقَرَة: ٢٥٥) پاشان خوێندیەوە تا تەواوی کرد.

مسروق وتی: ڕاستت کرد).

**١٦٨ - علي بن أبي طالب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (وا نابینم پیاوێک لە ئیسلامدا لەدایک بووبێت، یان گەیشتبێت بە ئیسلام بخەوێت هەتا ئەم ئایەتە نەخوێنێت: | **ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ** | هەتا کۆتایی ئایەتەکە، ئەگەر بزانن ئەوە چییە! ئەوە دراوە بە پێغەمبەرەکەتان ﷺ لە گەنجینەیەکی ژێر عەرش، پێش پێغەمبەری ﷺ ئێوە نەدراوە بە هیچ کەسێک، وە هیچ شەوێک نەخەوتووم ئیللا سێ جار خوێندوومەتەوە لە دوو ڕکعاتی پاش نوێژی عیشا ئەیخوێنمەوە، وە لە ویترەکەمدا، وە کاتێک ئەچمە ژێر جێگەکەمەوە).

١٦٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەو دوو ئايەتەى كۆتايى سورەتى البقرة بخوێنن، چونكە پەروەردگارم لە ژێر عەرشەوە پێى بەخشيوم).

---

: مەبەستى ئەو دوو ئايەتەيە، والله أعلم | ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ * لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ | (البَقَرَة: ٢٨٥ - ٢٨٦).

١٧٠ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەڵێت : (ئايەتەكانى كۆتايى سورەتى البقرة لە گەنجينەيەكەوەن لە ژێر عەرش).

١٧١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (الله سورەتى البقرة ى كۆتايى هێناوە بە دوو ئايەت پێى بەخشيوم لە گەنجينەكەى كە لە ژێر عەرش دايە، هەربۆيە فێرى ببن و ژن و منداڵەكانيشتان فێر بكەن . . .).

١٧٢ - معاذ بن جبل رضي الله عنه كاتێک سورەتى البقرة ى تەواو بكردايە | فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ | ئەيفەرموو : (آمين).

**١٧٣ - رسول الله** ﷺ ئەفەرموویّت : (دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی البقرة هەر کەسێک بیانخوێنێت لە شەودا ئەوە بەسیەتی ) .

**١٧٤ - يزيد بن الأسود الجرشي** ئەڵێت : (هەرکەسێک سورەتی البقرة و آل عمران بخوێنێت لە ڕۆژدا ئەوە بەری ئەبێت لە دووڕوویی هەتا شەو ئەکاتەوە ، وە هەر کەسێک بیخوێنێت لە شەودا ئەوەی بەری ئەبێت لە دووڕوویی هەتا ڕۆژ ئەکاتەوە ) .

**١٧٥ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەڵێت : (هەر کەسێک سورەتی آل عمران بخوێنێت ئەوە دەوڵەمەندە ) .

**١٧٦ - حارثة بن مضرب** وتی : (عمر بۆی نووسین کە فێری سورەتی النساء و الأحزاب و النور ببن ) .

**١٧٧ - رسول الله** ﷺ ئەفەرموویّت : (المائدة لە کۆتاییەکانی قورئانە کە دابەزیوە ، جا حەڵاڵەکانی حەڵاڵ بکەن ، وە حەرامەکانی حەرام بکەن ) .

**١٧٨ - جبير بن نفير** ئەڵێت : (حەجم کرد و ڕۆیشتم بۆ لای عائشة رضي الله عنها ، فەرمووی : ئەی جبير ، ئایا سورەتی المائدة ئەخوێنیت ؟

وتم : بەڵێ .

فەرمووی : کۆتا سورەتە کە دابەزیوە ، جا هەر حەڵاڵێکتان تێدا بینی بە حەڵاڵی بزانن ، وە هەر حەرامێکتان تێدا بینی بە حەرامی بزانن ) .

١٧٩ - أبي ميسرة ئەڵێت : (له المائدة دا هەژدە فەرز هەیە، وە هیچ مَنسوخ یێكی تێدا نییە) .

: (مَنسوخ) واته حوكمەكەی هەڵوەشابێتەوە بە ئایەتێک یان فەرموودەیەک .

١٨٠ - إبن عون ئەڵێت : پرسیارم كرد له الحسن : ئایا هیچ شتێک له المائدة نەسخ بووەتەوە ؟

وتی : (نەخێر) .

١٨١ - إبن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (سورەتی الأنعام له مەككه به یەک جار دابەزی، لەگەڵیدا حەفتا هەزار مەلائیكه دابەزی كه به دەوریدا تەسبیحاتیان ئەكرد) .

١٨٢ - أبي عطية ئەڵێت : (عمر بن الخطاب بۆی نووسین كه فێری سورەتی التوبة ببن، وە ئافرەتەكانتان فێری سورەتی النور بكەن) .

١٨٣ - حذيفة بن اليمان رضي الله عنه ئەڵێت : (پێی ئەڵێن سورەتی التوبة، وە ئەوە سورەتی العذاب ە) .

١٨٤ - سعيد بن جبير ئەڵێت : (وتم به إبن عباس : سورەتی التوبة .

فەرمووی : ئەوە ئاشکراکەر و ئابڕوو بەرەکەیە، ئەوەندە | وَمِنْهُمُ . . . . . وَمِنْهُمُ | دابەزی هەتا ترساین هیچ کەسێک نەهێڵێتەوە .

وتم : ئەی سورەتی الأنفال ؟

فەرمووی : دەربارەی جەنگی بەدر دابەزی .

وتم : ئەی سورەتی الحشر ؟

فەرمووی : دەربارەی بني النضير دابەزی ) .

: سورەتی التوبة باسی سیفەتی دووڕووەکانی تێدایە، الله تعالی پەنامان بدات .

١٨٥ - إبن شهاب الزهري ئەڵێت : (وتیان - واته هاوەڵان - ئەی رسول الله لە قژتدا پیری بەدی ئەکەین - واته موی سەرت سپی بووە - .

فەرمووی : (چۆن پیر نابم لە کاتێکدا سورەتی هود و | إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ | ئەخوێنمەوە ؟!) .

١٨٦ - أم موسى ئەڵێت : (الحسن یان الحسین بن علي رضي الله عنهم هەموو شەوێک سورەتی الکهف ی ئەخوێندەوە، بۆی نووسرابوو لە لەوحەیەکدا و هەموو شەویک ئەیگێڕا لەگەڵ خۆیدا لەلای هەر خێزانێکی بمایایەتەوە) .

**١٨٧ - رسول الله ﷺ** ئەفەرمووێت: (**هەرکەسێک دە ئایەتی سەرەتای سورەتی الکهف بخوێنێتەوە و پاشان بگات بە دەججال، ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، وە هەرکەسێک کۆتاییەکانی سورەتی الکهف لەبەر بکات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی ئەبێت بە نوورێک**).

**١٨٨ - محمد بن كثير** هەواڵی پێداین لە الأوزاعي ـەوە، لە عبدة بن أبي لبابة ـەوە وتی: گوێبیستی زر بن حبیش بووم وتی: (هەرکەسێک کۆتایی سورەتی الکهف بخوێنێتەوە بە مەبەستی ئەوەی لە کاتێکی دیاریکراوی شەودا بەخەبەربێت ئەوە بەخەبەر دێت).

عبدة وتی: (تاقیمان کردەوە بۆمان دەرکەوت کە وایە).

محمد بن كثير وتی: (ئێمەش زیاتر لە جارێک لە سەراپاکاندا تاقیمان کردەوە، جا هەڵئەستام لەوکاتەی کە ئەمویست، وە دەستم پێ ئەکرد لە فەرمایشتی: ﴿**إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا**﴾ (الكَهۡف: ١٠٧) هەتا کۆتاییەکەی).

**١٨٩ -** لە إبن عمر ـەوە لە **عمر** ـەوە رحمە الله کە: (لە سورەتی الحج ـدا دوو سوجدەی برد، وە فەرمووی: ئەم سورەتە فەزڵی دراوە بەسەر سورەتەکانی تردا بە دوو سوجدە).

١٩٠ - نبيه بن صؤاب وتی : (نوێژی بەیانیم کرد لەگەڵ عمر بن الخطاب له الجابية، سورەتی الحج ی خوێندەوە و دوو سوجدەی تێدا برد، پاشان فەرمووی : ئەم سورەتە فەزڵی دراوە بەسەر سورەتەکانی تردا بە دوو سوجدە ) .

١٩١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (سورەتی السجدة فەزڵی دراوە بەسەر بێجگە لە خۆیدا بە دوو سوجدە ) .

١٩٢ - أبي عطية ئەڵێت : (عمر بۆی نووسین کە ئافرەتەکانتان فێری سورەتی النور بکەن ) .

١٩٣ - لە صفية بنت شيبة ەوە لە عائشة ەوە کە : (باسی ئافرەتانی پشتیوانانی کردووە و بەباشی وەسفی کردوون و قسەی باشی لەبارەوە کردوون ، وە فەرموویەتی : کاتێک سورەتی النور هاتە خوارەوە خوارەوەی عاباکانمان دڕاند و کردمان بە خیمار ) .

١٩٤ - أبي وائل ئەڵێت : (علي بن أبي طالب رضي الله عنه إبن عباس ی کرد بە لێپرسراوی وەرزی حەج ، جا وتارێکی دا ئەگەر دەیلەم بیبیستایە موسوڵمان ئەبوون ، پاشان سورەتی النور ی بەسەردا خوێندنەوە ) .

١٩٥ - أبي وائل وتی : (إبن عباس سورەتی النور ی خوێندەوە ، وە تەفسیری کرد ) .

پیاوێک وتی : (ئەگەر دەیلەم گوێبیستی ببونایە موسوڵمان ئەبوون ) .

**١٩٦ - جابر بن عبدالله** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (رسول الله ﷺ نەئەخەوت هەتا | **الٓمٓ (١) تَنزِيلُ** | السجدة و | **تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ** | (المُلْك) ئەخوێند) .

**١٩٧ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : رسول الله ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا | **الٓمٓ (١) تَنزِيلُ** | و | **هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ** | ی ئەخوێند) .

**١٩٨ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرموویت : ( | **حم** | ـەکان جوانیی و ڕازاوەیی قورئانن) .

**١٩٩ - مسروق** ئەڵێت : (هەرکەسێک ئەیەوێت هەواڵی یەکەمینەکان و هەواڵی کۆتاییەکان و هەواڵی ئەهلی بەهەشت و هەواڵی ئەهلی جەهەننەم و هەواڵی دنیا و هەواڵی قیامەت بزانێت ئەوە با سورەتی الواقعة بخوێنێتەوە) .

**٢٠٠ - سليمان التيمي** وتی : عائشة رضي الله عنها بە ئافرەتانی فەرموو : (با هیچ یەکێکتان تەمبەڵ نەبێت لە خوێندنەوەی سورەتی الواقعة) .

**٢٠١ - رسول الله ﷺ** ئەفەرموویت : **(سورەتێکی سی ئایەتی قورئان تکای بۆ کەسێک کرد تا لێیبوردرا ، ئەویش | تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ | ـە )** .

٤٠٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : ( | إِذَا زُلْزِلَتِ | یەکسانە بە نیوەی قورئان ) .

---

: واتە لە پاداشتدا، والله أعلم .

٤٠٣ - بكر بن عبدالله المزني وتی : | إِذَا زُلْزِلَتِ | یەکسانە بە نیوەی قورئان ).

٤٠٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : ( | إِذَا زُلْزِلَتِ | یەکسانە بە نیوەی قورئان ، | وَٱلْعَٰدِيَٰتِ | یەکسانە بە نیوەی قورئان ) .

٤٠٥ - نوفل وتی : ڕۆیشتم بۆ لای رسول الله ، فەرمووی : (چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ؟ )

وتم : هاتووم چەند وتەیەکم فێر بکەیت کە لە پێش خەوتندا بیانڵێم .

فەرمووی : ( | قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ | بخوێنە ، پاشان لەسەری بخەوە ، چونکە ئەوە بەریبوونە لە شیرک ) .

٤٠٦ - أبو مسعود الأنصاري رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک شەو | قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ | بخوێنێت ، ئەوە زۆر و باشی کردووە ) .

٤٠٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : ( | قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ | یەكسانە بە چواریەكی قورئان ) .

٤٠٨ - أبو هريرة رضي الله عنه ئەڵێت : لەگەڵ رسول الله دا ﷺ رێم ئەكرد، بیستی پیاوێک | قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ * ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ | ی خوێند .

فەرمووی : (واجب بوو) .

پرسیم : چی واجب بوو ؟

فەرمووی : (بەهەشت ) .

٤٠٩ - لە أبو سعيد الخدري ـەوە كە پیاوێک وتی : ئەی رسول الله، دراوسێیەكم هەیە كە شەونوێژ ئەكات تەنها | قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ | ئەخوێنێتەوە .

وەک بڵێیت بە كەمی بزانێت .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی كە گیانی منی بەدەستە، یەكسانە بە سێیەكی قورئان ) .

٤١٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئایا یەكێک لە ئێوە تەمبەڵی ئەكات لەوەی لە شەودا سێیەكی قورئان بخوێنێتەوە ؟ الله الواحد الصمد ) .

---

: واتە سورەتی الإخلاص .

٢١١ - له أبو أيوب الأنصاري ـه‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ كه : ( ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ سێیه‌كی قورئانه ) .

٢١٢ - له أبو الدرداء ـه‌وه رضي الله عنه كه رسول الله ﷺ قورئانی دابه‌ش كرد بۆ سێ به‌ش ، فه‌رمووی : ( ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ به‌شێكیه‌تی ) .

٢١٣ - عبدالله بن خبيب وتی : له‌گه‌ڵ رسول الله ـدا بووم له ڕێگه‌ی مه‌ككه‌دا ، وه هاوه‌ڵه‌كانیشی له‌گه‌ڵدا بوو ، جا له شه‌ودا ته‌مومژێك هات به‌سه‌رماندا هه‌تا وای لێ هات هه‌ندێكمان دیارنه‌ماین له هه‌ندێكی ترمان ، كاتێك به‌یانیمان كرده‌وه رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (ئه‌ی ابن خبيب بڵێ) .

وتم : چی بڵێم ئه‌ی رسول الله ؟

فه‌رمووی : ( ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ ) .

جا خوێندیه‌وه ، منیش خوێندمه‌وه .

پاشان فه‌رمووی : (بڵێ) .

وتم : چی بڵێم .

فه‌رمووی : ( ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ) و خوێندیه‌وه .

منیش خوێندمه‌وه هه‌تا ته‌واو بوو .

پاشان فه‌رمووی : (هه‌رگیز هیچ كه‌سێك په‌نای نه‌گرتووه یان داوای یارمه‌تی نه‌كردووه به هاوشێوه‌ی ئه‌م دوو سوره‌ته) .

٢١٤ - إبن عابس الجهني رضي الله عنه ئەڵێت : رسول الله ﷺ پێی فەرمووم : (ئەی ابن عايش، ئايا هەواڵت پێ بدەم دەربارەی باشترينی ئەوەی كە خۆپارێزان داوای پاراستنيان پێ كردووە ؟) .

وتم : بەڵێ ئەی رسول الله .

فەرمووی : ( | قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ | و | قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ | ) .

٢١٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویێت : (چەند ئايەتێكم لەسەر دابەزی كە هەرگيز وەكو ئەوانم لەسەر دانەبەزيوە، المعوذتان) .

---

: واتە | قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ | و | قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ | .

٢١٦ - الشعبي ئەڵێت : (مسروق بن الأجدع و شتير بن شكل گەيشتن بە يەک، شتير بە مسروق ی وت : يان من لە عبدالله ـەوە شتێكت بۆ بگێڕمەوە و بەڕاستم بخەرەوە، ياخود تۆ بيگێڕەوە و بەڕاستت ئەخەمەوە .

مسروق وتی : بيگێڕەوە و بەڕاستت ئەخەمەوە .

شتير وتی : گوێبيستی عبدالله بووم وتی : الله لە ئاسمان و زەوی و بەهەشت و جەهەننەمدا دروستی نەكردووە گەورەتر بێت لە ئايەتێكی سورەتی البقرة : | ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ | (البَقَرَة : ٢٥٥) پاشان خوێنديەوە تا تەواوی كرد .

مسروق وتی : ڕاستت کرد .

وە گوێبیستی عبدالله بووم وتی : لە قورئاندا هیچ ئایەتێک نییە کۆکەرەوەتر بێت بۆ خێر و شەڕ لە ئایەتێک لە سورەتی النحل : | **إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ** | .

وتی : ڕاستت کرد .

وە بیستم عبدالله وتی : هیچ ئایەتێک نییە لە قورئاندا لە ئایەتێکی سورەتی الزمر هیوابەخشتر بێت : | **قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ** | .

وتی : ڕاستت کرد ) .

**٢١٧ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : (دوو ئایەت هەیە لە قورئاندا هیچ بەندەیەکی موسوڵمان لە پاش تاوانکردن نایخوێنێت ئیللا لێی ئەبوردرێت ) .

جا دوو پیاوی ئەهلی بەسرە ئەمەیان بیست و هاتن بۆ لای .

فەرمووی : (بڕۆن بۆ لای أبي بن کعب ، چونکە من دەربارەیان هەر شتێکم بیستبێت لە رسول الله ـەوە ﷺ أبي بن کعب یش بیستوویەتی ) .

چوون بۆ لای أبي بن کعب ، ئەویش پێی فەرموون : (قورئان بخوێننەوە ئەیدۆزنەوە ) .

جا قورئانیان خوێندەوە هەتا گەیشتن بە آل عمران ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴾ (١٣٥).

وە فەرمایشتی ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (النساء: ١١٠).

وتیان: دۆزیمانەوە.

أبي فەرمووی: (لە کوێدا).

وتیان: لە آل عمران و النساء.

فەرمووی: (خۆیەتی، خۆیەتی).

**٢١٨** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (لە سورەتی النساء دا پێنج ئایەت هەیە، دڵخۆش نابم ئەگەر لەبەرامبەریدا دنیا و ئەوەی تێیدایەتی بمدەنێ، وە ئەزانم ئەگەر زانایان بیخوێننەوە ئەزانن کامانەیە، فەرمایشتی الله عز وجل ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلًا كَرِيمًا ﴾ (٣١).

وە فەرمایشتی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴾ (٤٠).

وە فەرمایشتی | إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا | (٤٨) .

وە فەرمایشتی | وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا | (٦٤) .

وە فەرمایشتی | وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا | (١١٠) .

دڵخۆش نابم ئەگەر لەبەرامبەریدا دنیا و ئەوەی تێیدایەتی بمدەنێ ) .

٢١٩ - لە حنش الصنعاني یەوە کە پیاوێکی پێکراو - بریندار - تێپەڕێنرا بەلای عبدالله بن مسعود دا، ئەویش ئەمەی بە گوێیدا خوێند | أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثًا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ | (المُؤْمِنون : ١١٥)، جا چاک بوویەوە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (چیت بە گوێیدا خوێندەوە ؟) .

هەواڵی پێ دا، جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر کەسێک بەسەر شاخێکدا بیخوێنێتەوە لە جێی خۆی لائەچێت) .

٢٢٠ - عامر بن عبد قیس ئەڵێت : (چوار ئایەت هەن لە کتێبی الله عز وجل دا ئەگەر بیانخوێنمەوە بەلامەوە گرنگ نییە ڕۆژ و شەو لەسەر چی ئەکەمەوە .

فەرمایشتی | مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ | (فَاطِر : ٢) .

وە فەرمایشتی | وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ | (يُونُس : ١٠٧) .

وە فەرمایشتی | سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا | (الطَّلَاق : ٧) .

وە فەرمایشتی | وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا | (هُود : ٦) .

٢٢١ - عثمان بن عفان رضي الله عنه ئەفەرموویت : رسول الله ﷺ کاتێک سورەتێکی لەسەر دابەزیایە یەکێک لە نووسەرانی وەحی بانگ ئەکرد و ئەیفەرموو : (ئەم سورەتە لەو شوێنەدا دابنێ کە باسی فلانە و فلانەی تێدایە ) .

٢٢٢ - عبد خير ئەڵێت : (یەکەم کەس کە قورئانی لە نێوان دوو لەوحەدا کۆکردەوە أبو بكر بوو رضي الله عنه ) .

---

: واتە وەکو کتێب لە نێوان دوو بەرگدا داینا .

**٢٢٣** - **زيد بن ثابت** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (لە پاش جەنگی یەمامە أبو بكر ناردی بە دوامدا، عمر یشی لەلا بوو .

أبو بكر وتی : عمر هات بۆ لام و وتی : لە ڕۆژی جەنگی یەمامەدا قورئانخوێنی زۆر كوژراون، وە من ئەترسم لە هەموو جەنگەكانی تریشدا قورئانخوێنی زۆر بكوژرێت، جا بەو شێوەیە قورئانێكی زۆر ئەفەوتێت، وە من پێم باشە فەرمان بكەیت بە كۆكردنەوەی قورئان - **واتە لە كتێبێكدا** - .

منیش پێم وت : چۆن شتێك ئەكەم كە رسول الله ﷺ نەیكردبێت ؟

پێی وتم : سوێند بە الله ئەوە خێر و باشە .

جا بەردەوام عمر ئەوەی پێ ئەوتمەوە هەتا الله سنگی بۆ فراوان كردم دەربارەی، وە ئەوەم پێ باش بوو كە عمر پێی باش بوو، جا تۆ پیاوێكی گەنجی عاقڵیت هیچ گومانمان لەوە نییە، وە وەحی ت ئەنووسی بۆ رسول الله ﷺ، جا قورئان هەمووی كۆبكەرەوە .

زید وتی : سوێند بە الله ئەگەر بیانكردمایەتە لێپرسراوی گواستنەوەی شاخێك لە شاخەكان هێندەی ئەوە لەسەرم قورس نەبوو .

جا وتم : چۆن شتێك ئەكەن كە رسول الله ﷺ نەیكردووە ؟

أبو بكر وتی : سوێند بە الله ئەوە باش و چاكە .

جا بەردەوام أبو بكر و عمر ئەوەیان پێ ئەوتمەوە هەتا الله سنگی بۆ فراوان كردم دەربارەی وەك چۆن سنگی ئەوانی فراوان كردبوو .

جا منیش بەدوای کۆکردنەوەی قورئان کەوتم و کۆمکردەوە کە لەسەر پێستە و گەڵای دارخورما و بەردی سپی تەنک و سنگی پیاواندا بوو، جا کۆتایی سورەتی براءة م لەلای خزیمة بن ثابت بینیەوە : ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ * فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ (سُورَةُ التَّوْبَة).

إبراهيم بن سعد وتی : (المصحف ـەكە لەلای أبو بكر بوو تا وەفاتی كرد، پاشان لەلای عمر بوو تا وەفاتی كرد، پاشان لەلای حفصة بوو) .

---

**: لە فەرموودەیەکی صحیح دا کە لە هەریەک لە (مسند أحمد و سنن أبو داود و جامع الترمذي و سنن إبن ماجه) دا هاتووە رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : ( . . . دەست بگرن بە سوننەتی من و سوونەتی خەلیفە ژیرە هیدایەتدراوەکانەوە، بە خرێکانتان - دانەکانی پشتەوە - قەپی پێدا بکەن . . . ) .**

**جا کۆکردنەوەی هەموو قورئان لە یەک کتێبدا سوننەتی باشترین کەسە لە پاش رسول الله ﷺ، وە ئیجماعی هەموو هاوەڵانە رضي الله عنه .**

**لەوکاتەدا زیاتر پشتیان بە لەبەرکردن بەستووە، کاتێک ئیمامی عمر رضي الله عنه ئەمە ئەبینێت ئەزانێت ئەگەر وا بڕوات بەشێکی زۆری ئەو گەنجانەی کە قورئانیان لەبەرە شەهید ئەکرێن، لە بەرامبەر ئەوەدا ئەگەر قورئان لە یەک کتێبدا بنووسرێت ئەوە هەموو قورئان ئەپارێزێت و ئەمێنێتەوە، هەربۆیە ئەو پێشنیارە ئەکات بۆ ئیمامی أبو بكر رضي الله عنهم جميعا .**

٢٢٤ - علي رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ڕەحمەتی الله لە أبو بكر، یەكەم كەس بوو كە قورئانی كۆكردەوە) .

٢٢٥ - لە أبي أمامة بن سهل لە پوریەوە كە وتوویەتی : رسول الله ﷺ ئایەتی الرجم ی بۆ خوێندینەوە (الشیخ والشیخة إذا زنها فارجموهما ألبتة بما قضیا من اللذة) .

---

: واتە لە قورئاندا ئایەتی ڕەجم هەبووە، پاشان ئایەتەكە نەسخ بووەتەوە، بەڵام حوكمەكەی هەر ماوە .

٢٢٦ - لە إبن عباس ـەوە رضي الله عنهما وتی : (عمر وتاری دا فەرمووی : هەندێک كەس ئەڵێن ڕەجم چییە! لە كتێبی الله دا جەلدكردن هەیە .

بەڕاستی رسول الله ﷺ ڕەجمی كرد، وە ئێمەش ڕەجممان كرد لەگەڵی، سوێند بە الله ئەگەر لەبەر ئەو قسەیە نەبوویایە : (عمر لە قورئانی زیاد كرد) .

ئەوە ئەمنوسیەوە وەک چۆن دابەزیوە) .

٢٢٧ - عمر رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ویستم لە سووچێكی المصحف ـدا بنووسم : عمر بن الخطاب و عبدالرحمان بن عوف ئامادەبوون كە رسول الله ﷺ ڕەجمی كرد و ئێمەش ڕەجممان كرد) .

٢٢٨ - **عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەڵێت : (گوێبیستی هشام بن حكیم بن حزام بووم سورەتی الفرقان ی ئەخوێندەوە جیاواز لەوەی كە من ئەمخوێندەوە، وە رسول الله ﷺ بۆی خوێندبوومەوە، جا كراسەكەیم گرت و بردم بۆ لای رسول الله ﷺ، هەواڵم پێدا دەربارەی، وتم : گوێبیستی ئەمە بووم سورەتی الفرقان ی ئەخوێندەوە جیاواز لەوەی كە بۆت خوێندبوومەوە!

فەرمووی : (بیخوێنە) .

بەو شێوەیە خوێندیەوە كە لێیەوە بیستبووم .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئاوا دابەزیوە) .

پاشان بە منی فەرموو : (بیخوێنە) .

منیش خوێندمەوە .

پاشان فەرمووی : (ئاواش دابەزیوە، ئەم قورئانە بە حەوت لەهجە و شێوەزار دابەزیوە، كامیان ئاسانبوو ئەوەیان بخوێننەوە) .

٢٢٩ - **أبو جهیم الأنصاري** وتی : (دوو پیاو ڕاجیاوازیان تێكەوت دەربارەی ئایەتێكی قورئان، هەردووكیان ئەیانوت كە لە رسول الله ـەوە ﷺ وەریان گرتووە، هەردووكیان ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای رسول الله ﷺ، رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەم قورئانە بە حەوت لەهجە و شێوەزار دابەزیوە، دەمە دەمێی تێدا مەكەن، چونكە دەمە دەمێكردن تێیدا كوفرە) .

**٢٣٠** - **أبو عبيد القاسم بن سلام** ئەڵێت : (مەبەست لەو حەوت ە ئەوە نییە کە وشەیەک بە حەوت جۆر بخوێنرێتەوە، بەڵکو لەلای ئێمە ئەوەیە کە دابەزیوە بە حەوت لەهجەی جیاوازی عەرەب لە هەموو قورئاندا، جا وشەیەکیان بە لەهجەی هۆزێک بووە، وە دانەیەکی تریان بە لەهجەیەکی جیاواز بووە لەوەی یەکەم، وە دانەیەکی تریشیان بە لەهجەیەکی جیاوازتر بووە لەوانی دیکە، بەم شێوەیە هەتا حەوت لەهجە).

---

**: کە ئەوترێت قورئان لەسەر حەوت لەهجە و شێوەزار دابەزیوە، مەبەست پێی ئەو حەوت قیرائەتە بەناوبانگ و موتەواتیرەی قورئان نییە، بەڵکو بە حەوت لەهجە دابەزیوە، چونکە عەرەب ئەوکات نەخوێنەوار بوون، وە هەر هۆز و قەبیلەیەک لە زمانەکەیدا جیاوازی هەبووە لە هۆز و قەبیلەکەی تر، دواتر لە سەردەمی عثمان بن عفان ـدا بە ئیجماعی هاوەڵان رضي الله عنهم لەسەر یەک لەهجە کۆکرایەوە ئەوەش ئەم لەهجەیەی ئێستایە، دوای ئەوەی خەڵکی تازەموسوڵمان بوو خیلافیان تێکەوت هەریەکێکیان خوێندنەوەی خۆیی بۆ قورئان بە باشتر ئەزانی .**

**عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرموویت کە جیاوازیەکە وەکو ئەوە بووە (هَلُم، تَعال) هەردووکیان یاعنی (وەرە) بەڵام بە دوو لەهجەی جیاواز، وەک چۆن لە کوردیدا (وەرە و بێ)، یان (ئەڵێم و ئێژم و دەرێم) هەیە، هەرسێکیان هەمان مانایان هەیە، بەڵام بە سێ لەهجەی جیاوازن، والله أعلم .**

٢٣١ - أنس بن مالک رضي الله عنه ئەفەرموویت : (عثمان بەو سێ کەسە قورەیشیەی فەرموو کاتێک فەرمانی پێکردن بۆ نووسینەوەی المصحف : هەرشتێک ئێوە و زید بن ثابت تێیدا جیاواز بوون بە لەهجەی قورەیش بینووسن، چونکە بە لەهجەی ئەوان دابەزیوە) .

٢٣٢ - الضحاک بن مزاحم دەربارەی فەرمایشتی ﴿ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾ (القِيَامَة : ١٥) .

ئەڵێت : (واتە داپۆشەرەکانی، ئەهلی یەمەن بە داپۆشەر - السِّتر - ئەڵێن المعذار) .

٢٣٣ - عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەربارەی فەرمایشتی : ﴿ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴾ (النَّجۡم : ٦١) .

ئەفەرموویت : (گۆرانی، ئەوە یەمەنیە، اسمدي لنا واتە گۆرانیمان بۆ بڵێ).

---

: واتە ئەو وشەیە عەرەبەکانی یەمەن بەکاریئەهێنن و بە لەهجەی ئەوانە، ئەم ئەثەرە و چەندین ئەثەری دیکە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ئێمەی ئەهلی سوننە ئەبێت تەفسیری قورئان لە هاوەڵان و تابیعین و زانایانی سەلەفەوە وەربگرین چونکە ئەوان شارەزای زمانی عەرەبی و لەهجەکانی بوون، وە لە هەموو کەسێکیش زیاتر شارەزای فەرموودە و مانای فەرموودەکان بوون رضي الله عنهم و رحمهم الله .

٢٣٤ - لە عبيدالله بن عبدالله بن عتبة ـەوە لە إبن عباس ـەوە كە (پرسیاری لێ ئەكرا دەربارەی قورئان، بە شیعر وەڵامی ئەدایەوە).

أبو عبيد ئەڵێت: (واتە بەكاریئەهێنا بۆ تەفسیركردنی).

٢٣٥ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (نەمئەزانی | فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ | (الأَنْعَام: ١٤) واتای چییە هەتا دوو دەشتەكی هاتن بۆ لام دەمەبۆڵەیان بوو دەربارەی بیرێک، دانەیەكی وتی: (أنا فَطَرتُها)، واتە من دەستم پێ كردووە و هەڵمكەندووە).

٢٣٦ - أبو عبيد ئەڵێت: (ئەو فەرموودەیانەی كە باسی هۆز و بەڵگەهێنانەوە بە وتەی عەرەبی تێدایە ڕوونكەرەوەی ئەوەیە كە واتای حەوت حرف بریتیە لە حەوت شێوەزار و لەهجە.

یەكێک لە خەڵكی ماناكەی خستووەتەسەر فەرموودەیەكی تر: (قورئان لەبارەی حەوتەوە دابەزیوە: حەڵاڵ، وە حەرام، وە محكم، وە متشابە، وە هەواڵی پێشین، وە هەواڵی پاشین، وە هێنانەوەی نمونە).

شارەزای ئەم فەرموودەیەم، گوێبیستی حجاج بووم ئەیگێڕایەوە لە الليث لە عقيل لە إبن شهاب لە سلمة بن أبي سلمة لە باوكی بە مەرفوعی، بەڵام ئەمە هیچ پەیوەندی پێوە نیە، ئەمە ئەڵێت قورئان (لەبارەی حەوتەوە دابەزیوە)، واتە حەوت تایبەتمەندی.

بەڵام فەرموودەكانی تر ئەمەیە (قورئان دابەزیوە بە حەوت حرف).

وە حرف هیچ واتایەکی نییە جگە لە شێوەزار و لەهجە نەبێت، لەگەڵ ئەوەی کە لێکدانەوەی هەر فەرموودەیەک لە خودی فەرموودەکە خۆیدا ڕوون و ئاشکرایە .

ئایا نابینیت عمر فەرمووی : (گوێبیستی هشام بن حکیم بن حزام بووم سورەتی الفرقان ی ئەخوێندەوە جیاواز لەوەی کە من ئەمخوێندەوە) .

وە بە هەمان شێوە فەرموودەی أبي بن کعب و کەسێکی تر لە جیاوازبوون لە خوێندنەوەدا، وە جیاوازی عبدالله بن مسعود لەگەڵ بێجگە لە خۆیدا، وە وەکو فەرموودەکەی عمرو بن العاص .

ئایا نابینیت جیاوازیان لەو شێواز و شێوەزارانەدا بوو کە وشەکان تێیدا جیاواز بوون، وە دەربارەی لێکدانەوە هیچ جیاواز نەبوون، وتەکەی عبدالله بن مسعود ئەمە ڕوون ئەکاتەوە) .

**٢٣٧ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەمە وەکو وتەی هەریەکێکتانە : هَلُمَّ، وتعال) .

**٢٣٨ - محمد بن سیرین** ئەڵێت : (ئەمە وەکو وتەی هەریەکێکتانە : (هَلُمَّ، وتَعال، أقبل) .

---

: هەرسێکیان واتە وەرە بەڵام بە سێ لەهجە و شێوەزاری جیاواز .

**٢٣٩ - أبو عبيد** ئەڵێت : (هەموو ئەمانە واتای حەوت شێوەزارەكەت بۆ ڕوون ئەكاتەوە) .

**٢٤٠ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (پەیوەست بن بە تێگەیشتن لە دین، وە تێگەیشتنی لە زمانی عەرەبی، وە باشی و چاكی لە دەربڕیندا) .

**٢٤١ - خليد العصري** ئەڵێت : كاتێک سلمان **- الفارسي رضي الله عنه -** هات بۆ لامان هاتین بۆ لای تا قورئانی لەلا بخوێنین .

فەرمووی : (قورئان عەرەبیە، لەلای كەسێكی عەرەبی بیخوێننەوە) .

جا زید بن صوحان قورئانی بۆ ئەخوێندینەوە، سلمان یش چاودێربوو بە سەریەوە، ئەگەر هەڵەی بكردایە بۆی ڕاست ئەكردەوە، ئەگەر ڕاستی بكردایە ئەیفەرموو : (بەڵێ سوێند بە الله) .

**٢٤٢ - عبدالله بن عمرو بن العاص** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (نوێژی بەیانیمان لەگەڵ رسول الله دا ﷺ ئەنجام دا، هەندێک لە هاوەڵانی جیابوونەوە لەلای یەكێک لە ژووری خێزانەكانی و قورئانیان خوێند، جا لە شتێكدا ڕاجیاوازیان تێكەوت، وە من دوور بووم لێیان، رسول الله ﷺ بە تووڕەیی بەسەریاندا هات و فەرمووی : (قورئان هەندێكی بەڕاستخەرەوەی هەندێكی تریەتی، جا ئێوە هەندێكی بە هەندێكی بەدرۆ مەخەنەوە، ئەوەی كە زانیتان لێی قبووڵی بكەن، ئەوەشی نەتانزانی وازی لێبهێنن و بیگەڕێننەوە بۆ ئەوەی كە ئەیزانێت) .

جا هیچ کاتێک خۆزگەم بە خۆم نەخواستەوە بەشێوەی خۆزگەخواستنم بە دووربوونم لێیان، چونکە سەرزەنشتی رسول الله م ﷺ تووش نەبوو .

٢٤٣ - أبي قيس ی مولای ی عمرو بن العاص ئەڵێت : عمرو بن العاص لەگەڵ پیاوێکدا هاتن بۆ لای رسول الله ﷺ، لە ئایەتێکدا ڕاجیاوازیان تێکەوتبوو، رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (دەمە دەمێ لە قورئاندا مەکەن، چونکە دەمە دەمێکردن تێیدا کوفرە) .

٢٤٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (دەمە دەمێکردن لە قورئاندا کوفرە).

٢٤٥ - شعيب بن الحبحاب وتی : (ئەگەر پیاوێک لەلای أبو عالية الرياحي دا قورئانی بخوێندایە پێی نەئەوت : بەو شێوەیە نییە کە تۆ ئەیخوێنیتەوە .

بەڵکو ئەیوت : من ئاوا و ئاوا ئەیخوێنمەوە .

شعيب وتی : ئەمە باس کرد بۆ إبراهيم، وتی : پێم وابێت هاوەڵەکەت گوێبیستی ئەوە بووە کە هەرکەسێک کافر بێت بەرامبەر یەک پیتی ئەوە کافر بووە بە هەمووی) .

٢٤٦ - عبدالله بن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (بەشێکی کتێبی الله مەکێشن بە بەشێکی تریدا، چونکە ئەوە شک و گومان لە دڵتاندا دروست ئەکات) .

٢٤٧ - الشعبي ئەڵێت : (جبريل لە مانگی ڕەمەزاندا ئەوەی بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ئەخوێندەوە کە بە درێژایی ساڵەکە بەسەریدا دابەزیوە) .

٢٤٨ - إبن سيرين ئەڵێت : (هەواڵم پێدراوە كە هەموو ساڵێک لە ڕەمەزاندا قورئان ئەخوێنرایەوە بەسەر رسول الله دا ﷺ، لەو ساڵەی کە تێیدا وەفاتی کرد دووجار بەسەریدا خوێنرایەوە) .

٢٤٩ - أنس بن مالک رضي الله عنه ئەڵێت : (رسول الله ﷺ بە أبي بن كعب ی فەرموو : الله فەرمانی پێ کردم | لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ | (البَيِّنَة : ١) بەسەردا بخوێنم .

وتی : ناوی منی هێنا ؟

فەرمووی : بەڵێ .

جا دەستی کرد بە گریان - واته أبي رضي الله عنه - ) .

٢٤٩ - لە أبي بن كعب ـەوە رضي الله عنه كە رسول الله ﷺ پێی فەرمووە : (الله فەرمانی پێ کردم کە قورئانت بەسەردا بخوێنمەوە) .

وتی : ئایا پەروەردگارت ناوی منی هێنا ؟

فەرمووی : (بەڵێ) .

أبي وتی : | قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٌ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ | (يُونُس : ٥٨) .

أبو عبيد ئەڵێت : (لەلای ئێمە مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە رسول الله ﷺ ویستی قورئان بخوێنێتەوە بەسەر أبي بن كعب بۆ ئەوەی لێیەوە خوێندنەوە

فێر ببێت و تیایدا جێگیر بێت، وە بۆ ئەوەی قورئان بەسەردا خوێندنەوە ببێت بە سوننەتێک).

---

**: سوننەت لە فێربوونی قورئاندا ئەوەیە کە بڕۆیت لەلای کەسێک بیخوێنیت کە ئەویش کە لەلای شێخەکەی خوێندبێتی هەتا ئەگاتەوە بە هاوەڵێکی بەڕێز رضي الله عنهم، وەک چۆن لە ئەثەرەکانی دواتردا دەرئەکەوێت، والله أعلم.**

٢٥٠ - يحيى بن الحارث الذماري ئەڵێت: (قورئانم هەمووی خوێندەوە لەلای عبدالله بن عامر اليحصبي، وە عبدالله بن عامر هەموو قورئانی خوێندەوە لەلای المغيرة بن أبي شهاب المخزومي، وە المغيرة خوێندیەوە لەلای عثمان بن عفان، لەنێوانیاندا هیچ کەسێک نەبوو).

٢٥١ - لە عاصم بن بهدلة ـەوە کە (قورئانی خوێندووەتەوە لەلای أبي عبدالرحمن السلمي و زر بن حبيش، وە أبي عبدالرحمن قورئانی خوێندووەتەوە لەلای علي رضي الله عنه، وە زر لەلای عبدالله بن مسعود رضي الله عنه خوێندوویەتیەوە).

---

**: عاصم بن بهدلة (=عاصم بن أبي نجود) خاوەنی قیرائەتی (حفص عن عاصم) ـە کە خۆمان قورئانی پێ ئەخوێنینەوە.**

**٢٥٢** - **مجاهد بن جبر** ئەڵێت : (سێ جار هەموو قورئانم خوێندەوە بەسەر - یان لەلای - عبدالله بن عباس) .

**٢٥٣** - **أبو عبيد** ئەڵێت : (إسماعیل بن جعفر بۆی گێڕامەوە كە قورئانی خوێندووەتەوە لەلای عیسی بن وردان الحذاء، وە وتی كە لەلای سلیمان بن مسلم بن جماز یش خوێندوویەتیەوە .

وە سلیمان خوێندوویەتیەوە لەلای أبي جعفر یزید بن القعقاع ی مەولای عبدالله بن عیاش بن أبي ربیعة .

سلیمان وتی : وە أبي جعفر هەواڵی پێدام كە المصحف ی گرتووە بۆ عبدالله بن عیاش و خوێندنەوە لەوەوە فێر بووە .

وە أبو جعفر هەواڵی پێدام كە لە ساڵی الحرة دا لە مزگەوتی رسول الله ﷺ قورئانی خوێندووەتەوە - بەسەر خەڵكیدا -، وە الحرة ساڵی سی و شەش بوو) .

---

**: عبدالله بن عیاش رضي الله عنهم خۆی و باوكیشی هاوەڵی رسول الله ن ﷺ، ئەم ئەثەرانە و چەندین ئەثەری تر بۆمان دەرئەخەن كە هاوەڵان و تابیعین و زانایانی سەلەف بە گشتی فێربوونی قورئان یان وەكو زانستێك تەماشاكردووە و هەریەكێكیان بە سەنەد وەریگرتووە لەوەی پێش خۆی، ئەمەش نیشانەی پاراستنی قورئانە لەلایەن الله تعالی ـەوە .**

**وەک چۆن ئەفەرموویت | إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ | .**

**واتە : (ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووە، وە هەر خۆشمان ئەیپارێزین) .**

**٢٥٤** - **أبو عبيد** ئەڵێت : (کۆمەڵێک لە زانایان هەواڵیان پێدام کە وتەی هەندێکیان تێکەڵ بووە لەگەڵ هەندێکی تریاندا - **واتە أبو عبید هەمووی بەیەکەوە ئەگێڕێتەوە بەبێ دانەپاڵی هەر وتەیەک بۆ لای سەنەدەکەی** - کە أبي عمرو بن العلاء قورئانی خوێندووەتەوە لەلای مجاهد و سعید بن جبیر .

وە حمید الأعرج وتی : قورئان ئەخوێنمەوە بە خوێندنەوەی مجاهد .

وە لە أبي بكر بن عیاش ـەوە کە قورئانی خوێندووەتەوە لەلای عاصم بن بهدلة ) .

---

: أبي عمرو بن العلاء البصري خاوەنی یەکێک لە حەوت قیرائەتە بەناوبانگەکەیە، (الدوري عن أبي عمرو)، وە (السوسي عن أبي عمرو) .

**٢٥٥** - **علي** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (رسول الله ﷺ فەرمانتان پێ ئەکات بەوەی هەر پیاوێک بەو شێوەیە قورئان بخوێنێتەوە کە فێر کراوە ) .

**٢٥٦** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (من گوێبیستی خوێندنەوەکان بووم و بینیم کە نزیکن لەیەک ، جا بیخوێننەوە بەو شێوازەی کە فێرکراون ) .

**٢٥٧** - **عروة بن الزبیر** ئەڵێت : (خوێندنەوەی قورئان سوننەتێکە لە سوننەتەکان ، جا بیخوێننەوە بەو شێوەیەی پێتان خوێنراوەتەوە ) .

٢٥٨ - **جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : گوێبیستی رسول الله ﷺ بووم باسی ئەو ماوەیەی ئەکرد کە وەحی پچڕا، فەرمووی : (كاتێک بەرێگادا ئەڕۆیشتم گوێم لە دەنگێک بوو، سەرم بەرز کردەوە، بینیم ئەو فریشتەیەی کە لە ئەشکەوتی الحراء هات بۆ لام لەسەر کورسیەکە لە نێوان ئاسمان و زەویدا، هەستم بە ترسێکی زۆر کرد، هاتمەوە بۆ لای خەدیجە و پێم وت : دامپۆشن، دامپۆشن .

جا دایان پۆشیم .

پاش ئەوە الله عز وجل ئەمەی دابەزاند : | يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنذِرْ | ) .

٢٥٩ - **عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموێت : (یەکەم شت کە دابەزی بۆ سەر محمد ﷺ بریتی بوو لە : | ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ | (العَلَق : ١) .

٢٦٠ - لە **محمد بن عباد بن جعفر المخزومي** ەوە کە گوێبیستی یەکێک لە زاناکانیان بووە وتوویەتی : (یەکەم شت کە الله دایبەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەی بریتی بوو لە | ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ | هەتا فەرمایشتی | عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ | (العَلَق : ١ - ٥) .

وتیان : ئەمە ئەو سەرەتایەیەتی کە دابەزیە سەری لە ڕۆژی الحراء دا، پاشان الله ئەوە تری دواتر دابەزاند) .

٢٦١ - مجاهد بن جبر ئەڵێت : (لە یەکەمینەکان کە لە قورئان دابەزی بریتی بوو لە | ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ |، وە | نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ | (القَلَم : ١) .

٢٦٢ - الزهري ئەڵێت : (یەکەم ئایەت کە دەربارەی کوشتار دابەزی بریتی بوو لە | أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ | (الحَجّ : ٣٩) .

پاشان باسی کوشتار لە ئایەتانێکی زۆردا کرا) .

٢٦٣ - یوسف بن ماهک ئەڵێت : (لەلای عائشة ی دایکی ئیمانداران بووم رضي الله عنها کاتێک دەشتەکیەک هات وتی : ئەی دایکی ئیمانداران موسحەفەکەتم پێ پیشان بدە .

فەرمووی : (بۆچی ؟)

وتی : بۆ ئەوەی قورئان بنووسمەوە، چونکە ئێمە بەبێ ئەوەی کە لەلامان نووسرابێت ئەیخوێنینەوە - واتە بە لەبەر - .

فەرمووی : (جا چ شتێک زیانت پێ ئەگەیەنێت کە پێشتر چۆن خوێندووتەتەوە ؟ ئەوەی یەکەمجار لە قورئان دابەزی سورەتە درێژەکان بوو کە باسی بەهەشت و جەهەننەمی تێدا ئەکرا، هەتا ئەو کاتەی خەڵکی هاتن بەرەوپیری ئیسلام ئیتر حەڵاڵ و حەرام دابەزی .

ئەگەر یەکەم شت لەوەی دابەزیوە (سەرخۆشکەر مەخۆنەوە) بوویایە ئەوە ئەیانوت: واز لە سەرخۆشکەر ناهێنین .

وە ئەگەر (زینا مەکەن) دابەزیایە ئەیانوت: واز لە زینا ناهێنین .

کاتێک من منداڵ بووم لە مەککە یاریم ئەکرد ﴿وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ (القَمَرِ: ٤٦) ئەمە دابەزی بەسەر محمد دا ﷺ، وە سورەتی البقرة و النساء بەسەریدا دابەزی لەوکاتەی من لەلای بووم) .

جا موسحەفەکەی دەرهێنا و سوورەتەکانم بەسەردا خوێندەوە .

٢٦٤ - **عبدالله بن عباس** رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (سورەتی الأنعام بە یەک جار لە مەککە دابەزی، لەگەڵیدا حەفتا هەزار فریشتە دابەزین کە بەدەوریدا بە دەنگی بەرز تەسبیحاتیان ئەکرد) .

٢٦٥ - **عروة بن الزبير** ئەڵێت: (ئەوەی حەدد و فەرز بێت ئەوە لە مەدینە دابەزیوە، ئەوەشی باسی ئوممەتەکان و سزا بێت ئەوە لە مەککە دابەزیوە) .

٢٦٦ - **علقمة** ئەڵێت: (هەموو ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ نەی کە لە قورئاندایە لە مەدینە دابەزیوە، وە ئەوەی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ بێت لە مەککە دابەزیوە) .

٢٦٧ - **ميمون بن مهران** ئەڵێت: ئەوەی لە قورئاندا ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ یان ﴿يَا بَنِي آدَمَ﴾ بێت ئەوە مەککەییە، وە ئەوەی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بێت ئەوە مەدینەییە) .

٢٦٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (صحف ی إبراهیم لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان دابەزی، وە تەورات دابەزی بۆ سەر موسی لە شەشەمی مانگی ڕەمەزاندا، وە زەبور دابەزیە سەر داود لە دوانزەیەمینی مانگی ڕەمەزاندا، وە ئینجیل دابەزیە سەر عیسا لە هەژدەیەمینی مانگی ڕەمەزاندا، وە الفرقان دابەزیە سەر محمد لە بیست و چوارەمینی مانگی ڕەمەزاندا) .

٢٦٩ - عثمان بن عفان رضي الله عنه : (سورەتی البراء لە کۆتاییەکانی قورئان بوو کە دابەزی) .

٢٧٠ - البراء بن عازب رضي الله عنه ئەفەرموویت : (کۆتا ئایەت کە دابەزی ئەمە بوو | يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ | (النِّسَاء : ١٧٦) .

٢٧١ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرموویت : کۆتا ئایەت لە قورئان کە دابەزی بریتی بوو لە | وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ | (البَقَرَة : ٢٨١).

وتیان رسول الله ﷺ لەدوای ئەوە حەوت شەو مایەوە و ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کرد) .

٢٧٢ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرموویت : (شەویکیان لەلای أبو بکر ماینەوە بۆ هەندێ پێداویستی رسول الله ﷺ، پاشان ڕۆشتینە دەرەوە، رسول الله ﷺ لە نێوان من و أبو بکر ڕێی ئەکرد، کاتێک گەیشتین بە مزگەوت

پیاوێک قورئانی ئەخوێندەوە، جا وەستا تا گوێ بگرێت، وتم: ئەی رسول الله درەنگە!

دەستی لێ دام و منیش بێدەنگ بووم .

پیاوەیە قورئانی خوێندەوە و رکوعی برد و سوجدەی برد، وە دانیشت دوعای ئەکرد و داوای لێخۆشبوونی کرد .

رسول الله ﷺ فەرمووی: (داوا بکە تا پێت بدرێت) .

پاشان فەرمووی: (کێ پێی خۆش بوو قورئان بە تازەیی و پاراوی بخوێنێتەوە وەک چۆن دابەزیوە ئەوە با بیخوێنێتەوە وەک چۆن إبن أم عبد خوێندیەوە) .

من و هاوەڵەکەم زانیمان کە ئەو کەسە عبدالله بن مسعود ە .

کاتێک بەیانیم کردەوە ڕۆشتم بۆ لای تا مژدەی پێ بدەم، وتی: پێش تۆ أبو بکر هات .

هەرگیز پێشبڕکێم لەگەڵی نەکردووە لە خێرێکدا ئیللا پێشم کەوتووە) .

٢٧٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت: (هەرکەسێک حەز ئەکات قورئان بخوێنێتەوە بە تەڕ و پاراوی وەک چۆن دابەزیوە با بە خوێندنەوەی إبن أم عبد بیخوێنێتەوە) .

**٢٧٤** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (قورئان لە چوار کەس وەربگرن : لە عبدالله بن مسعود، وە أبي بن كعب، وە معاذ بن جبل، وە سالم ی مەولای أبي حذيفة ) .

**٢٧٥** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (بەرەحمترینی ئوممەتەکەم بۆ ئوممەتەکەم أبو بكر ە، وە توندترینیان لە دینی الله دا عمر ە، وە بەشەرمترینیان عثمان ە، وە زاناترینیان بە حەڵاڵ و حەرام معاذ بن جبل ە، وە خوێنەرترینیان بۆ قورئان أبي بن كعب ە، وە شارەزاترینیان دەربارەی فەرزەکان زيد بن ثابت ە، وە هەموو ئوممەتێکی ئەمینێکی هەیە، وە ئەمینی ئەم ئوممەتە أبو عبيدة بن الجراح ە ) .

**٢٧٦** - **عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (داروەرترینی ئێمە علي ە، وە خوێنەرترینی ئێمە أُبي یە ) .

**٢٧٧** - **أنس بن مالک** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ چوار کەس قورئانیان کۆکردەوە - **واتە هەموویان لەبەر بوو** - : معاذ بن جبل، وە زيد بن ثابت، وە أبو زيد، وە أُبي بن كعب ) .

**٢٧٨** - **إبراهيم النخعي** ئەڵێت : (ئەوانەی کە قورئانیان بۆ خەڵکی ئەخوێندەوە و فێریان ئەکردن لە هاوەڵانی عبدالله بن مسعود شەش کەس بوون : علقمة، وە الأسود، وە مسروق، وە عبيدة، وە عمرو بن شرحبيل، وە الحارث بن قيس ) .

**٢٧٩ - الحسن البصري** ئەڵێت : (عامر بن عبد قيس نوێژی بەیانی ئەکرد لە مزگەوت، لە سووچێکی مزگەوتەکەدا هەڵئەستا و ئەیوت : (بەسەر کێدا بیخوێنمەوە **- واتە قورئان -** ؟ ) .

جا خەڵک ئەهاتن بۆ لای و قورئانی بەسەردا ئەخوێندنەوە هەتا خۆر دەرئەکەوت و کاتی نوێژ ئەهات، هەڵئەستا و نوێژی ئەکرد هەتا نوێژی نیوەڕۆ ئەکرا، پاشان نوێژی ئەکرد هەتا نوێژی عەسر ئەکرا، پاشان هەڵئەستا و ئەیوت : (بەسەر کێدا بیخوێنمەوە ؟ ) .

جا قورئانی فێر ئەکردن هەتا هەڵئەستا بۆ نوێژی مەغریب، پاشان نوێژی ئەکرد هەتا نوێژی عیشا ئەکرا، پاشان ئەڕۆشتەوە بۆ ماڵەکەی، یەک پارچە نانی لە سەبەتەکەی دەرئەکرد و ئەیخوارد، وە ئاوی لەگەڵدا ئەخوارد، پاشان کەمێک ئەخەوت، پاشان هەڵئەستایەوە بۆ شەونوێژ، کاتێک ڕۆژ ئەبوویەوە پارچەنانێکی تری ئەخوارد و ئاوی ئەخواردەوە و دەرئەچوو بۆ مزگەوت ) .

**٢٨٠ - إبراهيم التيمي** ئەڵێت : أبو بكر الصديق پرسیاری لێکرا دەربارەی فەرمایشتی : ﴿ **وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا** ﴾ (عَبَسَ : ٣١) .

فەرمووی : (کام ئاسمان لە ژێر خۆیدا جێگەم ئەکاتەوە، وە کام زەوی ئەمگرێتە خۆی ئەگەر قسەیەک لە کتێبی الله عز وجل دا بکەم بە نەزانی ؟!) .

**٢٨١ - أنس بن مالك** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : عمر بن الخطاب لەسەر مینبەر ﴿ **وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا** ﴾ ی خوێندەوە، وە فەرمووی : (ئەمە الفاكهة یە زانیمان چییە، ئەی الأبّ چییە ؟ ) .

پاشان بەخۆیدا چوویەوە و فەرمووی : (ئەوە زۆرلەخۆكردنە ئەی عمر!) .

**٢٨٢** - **إبن أبي مليكة** وتی : پیاوێک پرسیاری كرد لە إبن عباس دەربارەی | **يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ** | (السَّجْدَة : ٥) .

إبن عباس فەرمووی : ئەی ( | **يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ** | (المَعَارِج : ٤) چییە ؟) .

پیاوەكە وتی : من پرسیارم لێ كردیت بۆ ئەوەی وەڵامم بدەیتەوە .

إبن عباس فەرمووی : (ئەوانە دوو ڕۆژن الله لە كتێبەكەیدا باسی كردوون ، الله زاناترە دەربارەیان) .

پێی ناخۆش بوو بە شتێک كە نایزانیت لە كتێبی الله عز وجل دا قسە بكات .

**٢٨٣** - **عمرو بن مرة** وتی : پیاوێک بە سعید بن جبیر ی وت : ئایا نەتبینی كاتێک إبن عباس پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەم ئایەتە : | **وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ** | (النِّسَاء : ٢٤) هیچ قسەی تێدا نەكرد .

سعید وتی : نەیئەزانی .

**٢٨٤** - لە یحیی بن سعید ەوە لە **سعید بن المسیب** ەوە كاتێک پرسیاری لێ بكرایە دەربارەی شتێک لە قورئان ئەیوت : (من لە قورئاندا هیچ ناڵێم - **واتە بە بۆچوونی خۆم** - ) .

**٢٨٥** - **عمرو بن مرة** وتی : پیاوێک پرسیاری لە سعید بن المسیب کرد دەربارەی ئایەتێکی قورئان .

وتی : (دەربارەی قورئان پرسیار لە من مەکە، بەڵکو پرسیار لەوە بکە کە ئەڵێت هیچ شتێک نییە دەربارەی - **قورئان** - لێی نادیار بێت) .

واتە عکرمة .

**٢٨٦** - **محمد بن سیرین** ئەڵێت : پرسیارم کرد لە عبیدة السلماني دەربارەی شتێک لە قورئان، وتی : (تەقوای الله ـت هەبێت، پەیوەستبە بە دەستپێوەگرتنەوە، ئەوانە ڕۆیشتن کە ئەیانزانی قورئان دەربارەی چی دابەزیوە **- واتە هاوەڵان رضي الله عنهم -** ) .

**٢٨٧** - **مسروق** ئەڵێت : (خۆتان لە تەفسیرکردن بپارێزن، چونکە ئەوە ڕیوایەت کردنە لە الله عز وجل ـەوە) .

---

**: واتە کاتێک تۆ ئەڵێیت تەفسیری فلانە ئایەت فلانە شتە، ئەوە تۆ وتووتە مەبەستی الله عز وجل لەو ئایەتە ئەوەیە .**

**٢٨٨** - **مسلم بن یسار** لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێت : (ئەگەر فەرمایشتێکت لە الله ـەوە گێڕایەوە بوەستە هەتا تەماشای پێش و پاشی ئەکەیت) .

---

: والله أعلم واتە كاتێک تەفسیری ئایەتێکت کرد بزانە ئایەتەکانی پێش خۆی و دوای خۆی باسی چی ئەکات هەتا نەکەویتە هەڵەوە و بەباشی لە مەبەستەکەی تێبگەیت .

٢٨٩ - إبراهيم النخعي ئەڵێت : (هاوەڵانمان خۆیان لە تەفسیرکردن ئەپاراست و لێی ئەترسان) .

٢٩٠ - هشام بن عروة ئەڵێت : (هەرگیز نەمبیستووە باوکم ئایەتێکی کتێبی الله تەفسیر بکات) .

٢٩١ - لە أبي علاء لە پیاوێکەوە وتی : چوومە لای تميم الداري و ساتێک قسەمان کرد هەتا هۆگری بووم، پێم وت : چەند جوزء قورئان ئەخوێنیتەوە -واتە لە شەودا - ؟

جا تووڕە بوو و فەرمووی : (لەوانەیە تۆ لەو کەسانە بیت کە لە یەک شەودا قورئان ئەخوێننەوە و کاتێک بەیانیان کردەوە ئەڵێن : ئەمشەو قورئانم خوێندەوە.

سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر چوار ڕکعات نوێژی سوننەت بکەم بەلامەوە خۆشەویسترە لەوەی لە یەک شەودا هەموو قورئان بخوێنم و پاشان بەیانیم کردەوە بڵێم : ئەمشەو هەموو قورئانم خوێندەوە) .

٢٩٢ - خزمەتکارەکەی الربيع بن خثيم وتی : (هەموو کار و کردەوەکانی الربيع بە نهێنی بوو، هەتا ئەگەر کەسێک بڕۆشتایەتە ژوورەوە بۆ لای و لە موسحەفدا قورئانی بخوێندایەتەوە ئەوە دایئەپۆشی) .

٢٩٣ - **بكر بن ماعز** ئەڵێت : (بەسەر ئەسپێکەوە دەرچووم و الربیع بن خثیم قورئانی ئەخوێندەوە، کاتێک دەنگی بیست و زانی ئاژەڵە خوێندنەوەکەی ڕاوەستاند، چووم بۆ شوێنێکی تر بۆ ئەوەی گوێم لە قورئان خوێندنەوەکەی بێت، بەڵام گوێم لە هیچ نەبوو) .

٢٩٤ - لە الأعمش ـەوە لە **إبراهیم النخعي** ـەوە کە : (قورئانی لە موسحەف ـدا ئەخوێندەوە، کەسێک مۆڵەتی چوونەژوورەوەی لێ وەرگرت، جا داپیۆشی، وە وتی : با ئەم کەسە نەبینێت کە من هەموو کاتێک قورئان لە موسحەف ـدا ئەخوێنمەوە) .

٢٩٥ - **عبدالعزیز بن مروان** وتی : (لە وەفدێکدا ڕۆیشتم بۆ لای سلیمان بن عبدالملک و عمر بن عبدالعزیز یشمان لەگەڵ بوو، لەگەڵ کوڕەکەیدا عبدالملک بن عمر مامەوە، کوڕێکی سەڵت بوو، لەگەڵیدا لە ماڵێکداماینەوە، جا نوێژی عیشامان کرد و هەر یەکێکمان چووینە سەر جێخەوەکەمان، پاشان عبدالملک هەستا و چراکەی کوژاندەوە، منیش تەماشام ئەکرد، دواتر هەستا نوێژی کرد هەتا من خەوم لێ کەوت، کە هەستام لەم ئایەتەدا بوو : ﴿ **أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ * ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ * مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ** ﴾ (الشُّعَرَاء : ٢٠٥ - ٢٠٧) .

دەستی کرد بە گریان، پاشان ئایەتەکەی خوێندەوە، هەرکاتێک تەواو ببوایە دووبارەی ئەکردەوە هەتا وتم : ئەمە گریان ئەیکوژێت .

کاتێک ئەوەم بینی وتم : لا إله إلا الله والحمد لله، وەک بڵێیت لە خەو هەستابم بۆ ئەوەی ڕایوەستێنم، کاتێک گوێبیستی من بوو بێدەنگ بوو گوێم لە یەک خشپە نەبوو) .

**٤٩٦** - مغيرة لە **إبراهيم النخعي** ـەوە وتی : (هیچ یەکێک لەو نوشتەیانەیان پێ باش نەبوو، لە قورئان و بێجگە لە قورئان .

پرسیارم کرد لە إبراهیم وتم : ئایا ئەم ئایەتە هەڵەواسم ﴿ **يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ** ﴾ (الأنبِيَاء : ٦٩) بە قۆڵمدا لەبەر تا یەک کە هەمە ؟

پێی خۆش نەبوو) .

**٤٩٧** - لە **أبو سعيد الخدري** يەوە رضي الله عنه كە : (کەسانێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تێپەڕین بە گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی عەرەبدا، جا کەسێکیان پێوەی درا، وتیان : ئایا لەناو ئێوەدا راقي دا تێدایە ؟

جا پیاوێکیان ڕوقیەی بۆ کرد بە أم الکتاب - **واتە سورەتی الفاتحة** - . . . ) .

**٤٩٨** - لە عمرة وە لە **عائشة** ـەوە رضي الله عنه كە : (أبو بکر ڕۆشتووەتە ماڵەوە بۆ لای و یەهودیەکی لابووە کە ڕوقیەی بۆ کردووە، ئەویش فەرموویەتی : بە کتێبی الله عز وجل ڕوقیەی بۆ بکە) .

**٤٩٩** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (پەیوەست بن بە دوو شیفاکەوە : قورئان و هەنگوین) .

أبو عبيد وتی : (عبدالله مەبەستی لەم ئایەتەیە | **وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ** | (الإسْرَاء : ٨٢) .

وە ئەو ئایەتەی لە سورەتی النحل دا هەیە | **يَخْرُجُ مِنْۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ** | ) .

**٣٠٠** - **طلحة بن مصرف** وتی : (ئەوترا : كاتێک قورئان خوێنرا لەلای نەخۆشێک ، ئەوە بەهۆیەوە هەست بە باشیەک ئەکات **- واتە لە نەخۆشیەكەیدا** .

جا ڕۆیشتمە لای خیثمة و نەخۆش بوو ، وتم : ئەبینم ئەمڕۆ باشیت .

وتی : قورئانم لەلا خوێندراوەتەوە ) .

**٣٠١** - **حجاج** وتی : (پرسیارم لە عطاء كرد دەربارەی پیاوێک كە شتێک لە قورئان هەڵئەواسێت ؟

وتی : گوێبیستی كەراهیەتی ئەو شتە نەبووین ئیللا لە ئێوەوە نەبێت ئەی ئەهلی عێراق ) .

**٣٠٢** - لە **مجاهد** و **أبي قلابة** ەوە كە نەیانبینیوە ئەوە كێشەیەكی تێدا بێت.

**٣٠٣** - **علي** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (نمونەی ئەوەی كە قورئانی پێدراوە و ئیمانی پێ نەدراوە ، وەكو نەعناع ە ، بۆنی خۆشە بەڵام تامی نییە .

وه نمونەی ئەوەی کە ئیمانی پێدراوە و قورئانی پێ نەدراوە، وەکو خورمایە، تامەکەی خۆشە بەڵام بۆنی نییە .

وه نمونەی ئەوەی کە قورئان و ئیمانی پێدراوە وەکو الأُتْرُجَّة یە، تامی خۆشە وە بۆنیشی خۆشە .

وه نمونەی ئەوەی کە نە ئیمانی پێدراوە نە قورئان وەکو الحنظلة یە، تامی ناخۆشە وە بۆنیشی ناخۆشە) .

---

: (الأُتْرُجَّة) میوەیەکە وەکو لیمۆ وایە .

وه (الحنظلة) شتێکە شکڵی وەکو شوتی ـە، بەڵام شوتی نییە و ناخورێت .

٣٠٤ - لە نافع ـەوە لە إبن عمر ـەوە کە : (ڕقی لە فرۆشتنی المصحف بووە).

٣٠٥ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (المصحف بکڕە، بەڵام مەیفرۆشە) .

٣٠٦ - لە أبو الزبير ـەوە کە گوێبیستی جابر بن عبدالله بووە دەربارەی فرۆشتنی المصحف فەرموویەتی : (کڕینی بەلامەوە خۆشترە لەوەی بیفرۆشم) .

٣٠٧ - سعيد بن جبير ئەڵێت : (بیکڕە و مەیفرۆشە) .

٣٠٨ - لە مغيرة ـەوە لە إبراهيم ـەوە کە : (ڕقی لە فرۆشتن و کڕینی بووە).

**٣٠٩** - لە إبن عون ـەوە لە **إبن سيرين** ـەوە كە: (ڕقی لە فرۆشتن و كڕینی بووە).

**٣١٠** - **أبي الضحى** ئەڵێت: (پرسیارم لە سیان لە ئەهلی كوفە كرد دەربارەی كڕینی المصحف، عبدالله بن يزيد و مسروق بن الأجدع و شريح، هەرسێكیان وتیان: بۆ كتێبی الله نرخ وەرمەگرە).

**٣١١** - **عمران بن حدير** وتی: پرسیارم كرد لە أبا مجلز دەربارەی فرۆشتنی المصحف، وتی: لە سەردەمی معاوية دا فرۆشرا.

وتم: ئایا بینووسمەوە؟

وتی: بە دەستی خۆت چی ئەكەیت بیكە).

**٣١٢** - **أبو عبيد** وتی: (ئەمانە دەربارەی كەراهەتی هاتووە، وە هەندێكیان ئاسانكاریان تێدا كردووە).

**٣١٣** - لە السري بن يحيى لە **مطر الوراق** ـەوە كە پرسیاری لێكرا دەربارەی فرۆشتنی المصحف، وتی: (دوو زاناكەی ئەم ئوممەتە وایان نەئەبینی لە فرۆشتنیدا كێشەیەک هەبێت، الحسن و الشعبي).

**٣١٤** - لە يونس ـەوە لە **الحسن** ـەوە كە: (وای ئەبینی كێشەیەک نەبێت لە فرۆشتن و كڕینی المصحف دا).

**٣١٥** - لە داود بن أبي هند ـەوە لە **الشعبي** ـەوە كە پرسیاری لێكراوە دەربارەی، وتوویەتی : (ئەو نرخی لاپەڕەكە و نووسینەوەكەی وەرئەگرێت) .

**٣١٦** - لە مسروق ـەوە لە **عبدالله بن مسعود** ـەوە كە : (حەزی لە تعشیر كردنی المصحف نەبووە) .

---

**: تعشیركردن واتە دە ئایەت دە ئایەت جیای بكەیتەوە لەناو المصحف ـەكەدا، وەكو ئەوە وایە دە ئایەت نووسرابێت، پاشان نیشانەیەک كرابێت، ئینجا دە ئایەتی تر نووسرابێت.**

**٣١٧** - لە مسروق ـەوە لە **عبدالله بن مسعود** ـەوە كە : (ئەو تعشیر ـانەی ئەسڕیەوە كە لە المصحف ـدا هەبوو) .

**٣١٨** - لە لیث ـەوە لە **مجاهد** ـەوە كە : (حەزی لە تعشیر كردنی المصحف نەبووە) .

**٣١٩** - **أبي بكر السراج** وتی : وتم بە أبي رزین : ئایا لە المصحف ـەكەمدا بنووسم سوورەتی ئەوە و ئەوە ؟

فەرمووی : (نەخێر، ئەترسم كۆمەڵەیەک پەیدا ببن كە شارەزا نەبن و وا بزانن كە لە قورئانە) .

---

**: وەک چۆن ئێستا لە سەرەتای هەموو سوورەتێكدا ناوی سوورەتەكە نووسراوە .**

**٣٢٠** - **أبي وائل** وتی : (المصحف یێک بەلای عبدالله دا تێپەڕێنرا کە بە زێڕ ڕازێنرابوویەوە، فەرمووی : باشترین شت کە قورئانی پێ برازێنرێتەوە خوێندنەوە و شوێنکەوتنیەتی بە حەق) .

**٣٢١** - لە عكرمة ەوە لە **عبدالله بن عباس** ەوە کە : (کاتێک المصحف یێکی ڕووپۆشکراو بە زیو یان زێڕی ببینیایە ئەیفەرموو : وا لە دز ئەکەن بیدزێت، لەکاتێکدا جوانی و ڕازاوەییەکەی لە ناویدایەتی ؟!) .

**٣٢٢** - **أبو ذر** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەگەر المصحف ەکانتان ڕووپۆش کرد بە زێڕ و و زیو، وە مزگەوتەکانتان ڕازاندەوە، ئەوە بەهیلاکچوون بۆ ئێوە) .

**٣٢٣** - لە المغيرة ەوە لە **إبراهيم** ەوە کە : (ڕقی لەوە بووە المصحف بە زێڕ بنووسرێتەوە) .

وە فەرمانیان ئەکر ئەگەر لاپەڕەیەکی المصحف بڕزایە و کۆن ببوایە ئەوە دفن ی بکەن) .

---

: (دفن ی بکەن) واتە چاڵێک هەڵبکەنن و لاپەڕەکەی تێبکەن و بە خۆڵ دایبپۆشن.

**٣٢٤** - لە إبن عون ەوە لە **إبن سيرين** ەوە کە : (وای نەبینیوە لە ڕازاندنەوە و ڕووپۆشکردنی المصحف بە زێڕ یان زیو کێشەیەک هەبێت) .

٣٢٥ - لە أبي الأسود ـەوە كە : (عمر بن الخطاب بینی کەسێک المصحف ێکی پێیە نووسیویەتی بە خەتێکی ورد .

فەرمووی : ئەمە چییە ؟

وتی : هەمووی قورئانە .

جا ئەوەی پێ باش نەبوو، وە لێیدا، وە فەرمووی : (کتێبی الله بەرز ڕابگرن) .

وە کاتێک المصحف ێکی گەورەی ببینیایە دڵی پێی خۆش ئەبوو .

٣٢٦ - أبي حكيمة العبدي وتی : من المصحف م ئەنووسیەوە، جارێکیان کاتێک المصحف ێکم ئەنووسیەوە علي رضي الله عنه بەلامدا تێپەڕی، وەستا تا سەیری نووسینەوەکەم بکات، فەرمووی : (قەڵەمەکەت گەورە بکە) .

منیش بەشێکم لە قەڵەمەکەم لێکردەوە و پاشان دەستم کردەوە بە نووسین .

فەرمووی : (بەڵێ ئاوا دەریبخە وەک چۆن الله عز وجل دەریخستووە) .

٣٢٧ - لە الأعمش ـەوە لە إبراهيم ـەوە کە : (علي رضي الله عنه پێی خۆش نەبووە قورئان لە شتێکی بچووکدا بنووسرێت) .

٣٢٨ - لە واصل ی مەولای أبي عيينة ـەوە لە إبن سيرين ـەوە کە : (پێی خۆش نەبووە قورئان بە خێرایی بنووسرێتەوە) .

٣٢٩ - له عبدالله بن شوذب ـهوه له **الحسن** ـهوه كه : (ڕێگەی دا به مالک بن دینار و مطر - پاره - وەربگرن لە بەرامبەر نووسینەوەی المصحف ) .

٣٣٠ - **عبدالله بن أبي بكر** وتی : رسول الله ﷺ بۆ باپیرمی نووسی کە : (تەنها طاهر دەست لە قورئان ئەدات ) .

---

: (پاک = طاهر) واتە کەسێک دەستنوێژی هەبێت .

٣٣١ - له نافع له **إبن عمر** ـهوه كه : (دەستی نەئەدا لە المصحف تەنها بە طاهر ی نەبێت ) .

والحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام علي سيد المرسلين

